زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
٢٩




# جەنگی نەریتەکان

وەرگێڕانی

ژوانی گەلالی

تفسیر
١٤٢٥ك هەولێر ٢٠٠٤ز

# مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشنا کردنی خوێنەری لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین.
- شارەزا کردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیان لە گشتگۆ و بەند و بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و ڕەوتگەرایی.
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتییەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردووە.

دەگەڵ ڕێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نووسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نییە ئێمە پابەندی هەموو بیروبۆچوونەکانیان بین.

با دەستووریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

# جه‌نگی نه‌ریته‌كان

نووسینی

محمد قطب

وه‌رگێڕانی

ژیوانی گه‌لاڵی



١٤٢٥ هه‌ولێر ٢٠٠٤

ناوی کتێب بە عارەبی: معركة التقاليد
ناوی نوسەر: محمد قطب
ناوی کتێب بەکوردی: جەنگی نەریتەکان
ناوی وەرگێڕ: ژیوانی گەلاڵی
چاپ و بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٥ك ٢٠٠٤ز
چاپکردنی: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٧ ساڵی ٢٠٠٣

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
تەلەفۆن : ٢٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
مۆبایل : ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

ئەمڕۆ لەم وڵاتە و لە تێکڕای ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا (هەرا)یەك بەرپایە بە نەریتەکانەوە پەیوەستە و جەنگێکیش لە ئارادایە و لە گەڕ ناکەوێ، ئەم نەریتە (بەسەرچوانە).. ئەم نەریتە (کۆنانە).. ئەم نەریتە (دواکەوتنخوازانە ).. ئەم نەریتە وشك و بەرد ئاسا و.. دواکەوتو و بۆگەنیوانە دەبێ لە ناوببرێن، دەبێ لە بناغەڕا هەڵتەکێن.. دەبێ بخرێنە ژێر پێیان.

دەبێ کۆمەڵگەیەکی تازە دامەزرێ.. کۆمەڵگەیەکی ئازاد.. کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتنخواز.. کۆمەڵگەیەکی گەشەسەندو و.. کۆمەڵگەیەکی ڕەها لە کۆت و بەندان.

جەنگی نەریتەکان بەو شێوەیە هەڵدەسوڕێ.

جەنگێکی گەرمە و هەموو بوارێکی داگرتوە.

گۆڕەپانەکەی بریتییە لە ماڵ و شەقام و.. سینەما و فێرگە و.. میترۆ و ئۆتۆمبێل و.. ڕۆژنامە و گۆڤار و.. وتار و کتێب و.. لادێ و شار.

سەربازەکانیشی بریتین لە هەموو خەڵکی.

سەربازەکانی کچ و کوڕی لاون و.. باوکان و منداڵان و مامۆستا و قوتابیانن و نوسەرانی پیاو و ژنن و چاك و خراپن و هەموو مرۆڤێکی نێر و مێیە.

* **

ئاسایی بو کە ئەم جەنگە لە میسر و لە تێکڕای ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بەرپا بێ.

مەسەلەکە ئاسایی بوو بە گوێرەی ئەو روداوانەی رۆژهەلآت لەو ماوەیەی دواییدا تێیدا ژیاوە، بە گوێرەی ئەو گەشەسەندن و گۆڕانکاریانەی ئەم ناوچەیە لە جیهانی سیاسەت و جیهانی ئابوری و جیهانی هزر و جیهانی رۆشنبیری بە سەری برد.. لە چەمکە تیۆری و جێبەجێکردنە کرداریەکاندا.. لە شتە هەموەکی و بەشەکیەکان[1] و.. لە هەمبوو بوارێکی ژیاندا.

جیهانی ئیسلامی سەرخەوێکی درێژی شکاند کە بە لای کەم دو سەدەی تەواوی خایاند و.. ئەو خەوتنە دور و درێژەش دەرەنجامی ماوەیەك بەستەڵەك بون و رەقهەلآتنی[2] پێشتر بو، بەستەڵەکی هزری و هەستی و کرداری.. ئەو بەستەڵەکەی هزرەکانی کردنە بنچینەی بێگییان و مردوو و.. ویژدانی کردە هەستێکی دابڕاو لە ڕەسەنایەتی و راستگۆیی و.. کردەوەی کردە بە ئەنجامدانێکی میکانیکی دور لە ژیان و لە داهێنان.

ئەو بەستەڵەکەی جیهانی ئیسلامی وا لێکرد ژیارە مەزنەکەی پێشوو، هزر و پیادە کردنە کۆنەکانی بەبێ زیادبوون (بەدوای خۆیدا راکێشێ )، شتێکی زیندوی تازەی نەخستە سەر کە دەگەڵ هەنگاوەکانی زەمەن و هەنگاوەکانی ژیان بکەوێتە ڕێ.

پاشان جیهانی ئیسلامی بەهۆی هەژان و داخورپانی توندی بومەلەرزە ئاسا وەئاگا هات.

لە گەڵ تەپەی پێی رۆژئاوای ئیمپریالیست وەئاگا هات کە دەهاتە ناو ماڵەکەی و تالآن و برۆ و گەندەڵی و کاولکاری بۆ هەمو شتێکی پیرۆز و خۆشەویست تێدا

---

[1] تیۆری: نظری. هەمووەکی: کلي. بەشەکی:جزئي.
[2] بەستەڵەك: جمود. رەقهەلآتن: تحجر.

ئەنجام دەدا.

وە ئاگاهات و.. هەستاوە تۆزی ئەو سەدە درێژانەی لە خۆی تەکاند.

نەفامی و بەستەڵەك و رەقهەڵاتنی لە خۆتەکاند.

گەلێك پێکدادانی توندیش لە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا رویاندا و.. تێکەڵبونیش هاتنە ئارا.

پێکدادان بە چەك و پێکدادان بە هزر و پێکدادان بە بیروباوەڕ.

هەروەها تێکەڵبون لە سیاسەت و تێکەڵبون لە کەلتور[1] و تێکەڵبون لە نەریتەکان.

تەنیا تاکە پردێکیش نەبو کە رۆژئاوای پێدا بۆ رۆژهەڵات پەڕیەوە، بەڵکو گەلێك پرد و رێگەی جیا جیا هەبوون.

جارێك هێرشی جەنگی بوە و چەك و تفاقی لەگەڵ خۆی هێناوە.

جارێکیش هێرشی ئابوری بوە و سەرمایەی لەگەڵ خۆی هێناوە تا بیخاتە گەڕ و زێری رۆژهەڵاتی پێ دەربێنی و لەوێ بەسەر ئیمپریالیستانی دابەش بکا.

جارێکی دیش هێرشێکی هزری بوە و کتێب و رۆژنامە و مامۆستا و قوتابخانەی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە.

جارێکی دیکەش هێرشیکی رۆحی بوە و بیروباوەڕی ناو گیانانی داگیرکردووە.

هەموو دەمێش هەر هێرش بوە.. جا نیشانەکانی ئاشکرا بوبن یان بزر.

* * *

---

١ کەلتور: ثقافة.

لە ناوەڕاستی ئەو هەژانە توندەی کە ڕۆژهەلاتی ئیسلامی لەسەر دەستی ڕۆژئاوای داگیرکەر توشی هات و... لەناو جەرگەی تێکوشانی سیاسی و ئابوری و هزری، کە بە دوای ساتی وەئاگاهاتنەوە داهات... لە سەرجەم ئەو کاتانەدا گەلێك لە نەریتەکانی ڕابردوو و هزر و بیروباوەڕ و چەمکەکانی تێکشکان و ئاساییش بو کە تێکبشکێن.

جا کۆمەڵگەی تازەپێگەیشتوو بە دوای نەریت و هزر و بیروباوەڕ و چەمکی نوێدا گەڕا... ئاساییش بو کە بگەڕێ.

لە میانەی ئەم گەڕانەشدا گەورەترین جەنگ بەرپا بو.. جەنگی نەریتەکان.

ئایا ڕابردوو لەسەر بنچینەکانی پێشوی بینیات بنێینەوە؟

ئایا کۆمەڵگەیەکی نوێ لە بناغەڕا بنیات بنێن و چاو لە هەموو ئەوەی کۆن بپۆشین؟

ئایا دەکرێ بنیاتە کۆنەکە بە هەرشێوەیەك بێ بگەڕێتەوە؟

ئایا دەکرێ کۆمەڵگەیەکی نوێ دامەزرێ هەر هیچ پەیوەندی بەکەلەپوری کۆنەوە نەبێت... کەلەپوری ژینگە و کەلەپوری هزر و کەلەپوری بیروباوەڕ؟

ئایا کۆن و تازە تێکەڵ کەین؟

ئایا دەکرێ ئەو تێکەڵکردنە لە نێوان بەها جیاجیاکان و پێوەرە جیاوازەکان و چەمکە پێچەوانەکان بێتە ئارا؟

بەڵکو ئایا هەموو مرۆڤایەتی کۆنینەیەکی هەیە پەیوەستی بکا؟

ئایا هەرگیز هیچ پێوەر هەن نەگۆڕ بن؟

ئایا بۆ هیچ نەوەیەك لەسەر زەوی پێویستە کە ئاوڕ لە پشتەخۆی بداتەوە؟

ئەگەر ئەمە لە رابردوشدا دروست بێ، لە کۆمەڵگای کشتوکاڵی مۆڵخواردوی گەنیوی دواکوتوی خاوەن ئاسۆی بەرتەسك، ئایا لە کۆمەڵگەی پیشەسازی، بەڵکو لەسەردەمی ئەتۆمیشدا دروستە؟

ئایا دروستە مرۆڤایەتی هەر لە بنەڕەتدا نەریتی هەبێ؟

یان ئەم نەریتانە مایەی ساردبونەوەن لە سەردەمی ئەتۆم و سەردەمی موشەکدا[1] لەسەردەمی رەهابوونی تەواو لەهەموو کۆتێك.. سەردەمی قەڵەمباز لە زەوی و لە بۆشایی ئاسماندا.. سەردەمی ئازادی تەواو لە مادە و لە مرۆڤدا؟

ئەمانە برە سوتەمەنیەکی جەنگەکەن..

ئێمەش لێرەدا نامانەوێ بەپەلە حوکم لە سەر هەریەك لەومەسەلانە بدەین.

بەڵکو لەم توێژینەوە بچوکە دەمانەوێ مەسەلەکە لە سەرچاوە و لە گەشەسەندنی بخەینە رو. بەڵکو لەبەر تیشکی لێکۆڵینەوەدا بگەینە راستی.

تکای سەرکەوتنیشمان لە خودایە

محمد قطب

---

١ موشەك: صاروخ.

# گەشتێک لەگەڵ مێژودا

چۆن نەریتەکان لە ئەوروپادا دارمان؟

ئەوروپا رۆژێك لە رۆژان کیشوەرێکی خودان نەریت بو، ئەدی چۆن ئـەو گۆڕانـە مەزنەی بەسەر داهات کە نەریتەکانی تێکشکاندن و لە کۆت و پێوەندان بـەرەڵلای کردن؟

لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەوروپا زۆر بەسودە بۆ تۆژینەوەی ئەو جەنگەی کە ئەمڕۆ لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بەرپایە، چونکە ئەوروپا مرۆڤە و ئێمەش مرۆڤین.. هەمو مرۆڤایەتیش سیمای هاوبەشـیان لـە نێوانـدا هەیـە و پێکـەوە پەیوەسـت و لێـك نێزیکن، ئەوجا مرۆڤ لە هەر شوێن و پنتێکـی زەوی بـێ دەتوانـێ کـە چـاودێری هەنگاوەکانی مرۆڤی بـرای بکـا.. ئیـتر یـا دەیکاتـە پێشـەنگ، یـانیش پـەندی ئەزمونەکە و وانەی مێژوی لـێ وەردەگرێ.

*

هەروەها رۆژێك لە رۆژان ئەوروپا هەر بە تێکڕایی مەسیحی بـو، جـا رۆچونـی بیروباوەڕ لە دەرونی ئەوروپیان.. قوڵ بێ یاخود هەر ڕوەکی.. بە دڵگەرمی بێ یـان بەفشە.. ڕەسەن بێ یان چاولێکەری.. ویژدانی بێ یاخود فیکری.. هەر چۆنیك بـێ ئەوروپا پێش سێسەد ساڵان بەبێ گومان لەمڕۆ توندتر دەستی بە بیروباوەڕەکەیـەوە

گرتبوو، زیاتریش لە چەرخی نوێی کەوتبوە بەر کاریگەری چەمك و بۆچـون و بـیرو فروسمانەکانی[1]

دەمانەوێ لەم گەڕانە خێرایەدا شوێنپێی زەمەن لەم دو سـەدەیەی دوایـیدا لـە ئـەوروپادا هـەڵگرین. هـەتا فاکتـەری گـۆڕان و ناڕاسـتەی روداوەکـان بخەینەبـەر تۆژینەوە.هەروەك -لەبەر چەند هۆیەکی کە پاش تۆزیـك دەردەکـەون- دەمانـەوێ هێڵێکی ئاشکرا لە نێوان جیهانبینی و هـزری خـەڵکی لـە پێـش دارویـن و پـاش داروین رابکێشین.

ئاسایی و ئاشـکرایە کـە مێـژوش هێڵـی گردەبـڕی[2] تێدانیـە، بـەڵکو هـەمو هێڵەکانی تێکچڕژاو و پلەپلە و لە وەرگەڕانێدا هێدین، لەگەڵ ئەوەش هێندێك هێڵ هەن زۆر دیار و ئاشکران و لەسەر ڕوپەری زەمەندا بەرز و بڵند و بەرجەستەن.

ئەگەرچی سەرجەم ئەوروپا لە -تێکڕای- دیرۆکی[3] خۆیدا دینداریەکەی زۆر قوڵ نەبووە، بەلاّم جیهانبینی دینی مەسیح بەسەر بیرکردنەوەی ئـەوروپاییدا زاڵ بـوە و بەلای کەمی لایەنێکی لە بەرنامەی ژیان ئاراستە کردوە.

جیهانبینی ئاینی مەسیحی دەیگوت خوایەك هەیە گەردون و ژینی ئـەفراندون، لەپاشـاندا مرۆڤیشـی وەدیـهێناوە، دیسـان ئـەو جیهانبینینـە دەیگـوت کـەوا ئافەریدکار[4] مەبەستێکی لە ئەفراندنی گەردون وژیان و مرۆڤدا هەیە، مرۆڤیش بـە تایبەتی رۆڵێکی گـەورەی لـەم ژیانـەدا هەیـە.. چونکـە خـودا بـە وێنـەی خـۆی ئەفراندویەتی. رێزی گرتوە و لە گشت بونەوەری زەوی بە چاتر و هەورازتری داناوە،

---

١ فروسمان: إيحاء.

٢ گردە بڕ: حاسم.

٣ دیرۆك: مێژو.

٤ ئافەردەیکار: خالق.

گەلێك سیمای واشی بە مرۆڤ بەخشیوە كە ئافەریدانی[1] دیكە لێی بێبەشــن، وەك زمان و وەك بیركردنەوە و وەك گیان.

سەرەڕای ئەمانەش ئــەو ڕوانــین و جیهانبینیــە دەیگـوت خـوا هەمیشــەكی[2]و جێگیرە، مەبەستەكەی لە ئەفراندنی مرۆڤیش هەر هەمیشەكی و جێگـیرە، ئـەوجا زۆران جار –بەشێوەیەكی- ویژدانی و جاربەجاریش فەلسەفیانە ڕێكیان دەخست كە ژیانی مرۆڤ جێـگیرە و سیستەمەكانی جێگیرن و غەریزەكانی جێگیرن و بیروباوەڕ و هزر و نەریتەكانی جێگیرن و هیچ كامەیان لــێ ناگۆڕێن.

جا بەم بیرۆكەی نەگۆڕیە دنەی دەدان كە سیستم و بنەما و هــزر و نەریتــەكانی ژیان لە كۆمـەڵگەی كشتوكاڵی دەرەبەگیدا تەواو جێگیر و نــەگۆڕن.. بـۆ نزیكـەی هەزارساڵیش، هەر بەم نەگۆڕیەمانەوە.

(زانیاری)یەكانیشیان لە بارەی گەردون و سروشــت و ژیانناســی پێــی دەگوتــن هەموشتێك هەر جێگیرە و لە وێنەی خۆیدا نەگۆڕە، ڕوەك بە هەمو جۆرەكانی هەر لــەو ڕۆژەی خــوا لــە ســەر زەوی وەدیــهێناوە نــەگۆڕاوە و وەك خــۆی مــاوە، گیانلەبەریش بەهەمو ڕەگەز و جۆرەكانی هەر بەو شێوەیە ماوەتــەوە كـە خــوا لــە سەرەتاوە وەدیهێناوە، ئەستێرە و كەلو[3] و مانگەكان و زەویش لە وەتەی هەن هــەر بەم شێوەیە جێگیرەن نەگۆڕاون نە دەگۆڕێن هەتا ئەوەی لە ڕۆژی دوایــی بەســەریان دێ.

مرۆڤیش بەهەمان شێوە.. هەر لە ئادەمەوە تــا ئــەمڕۆ.. هــەر مرۆڤــە هــەمو شتێكی تێدا جێگیر و نەگۆڕە: جەستەی و ئاوەزی و گیانی.

---

١ ئافەریدان:مخلوقات.

٢ هەمیشەكی:أزلي.

٣ كەلو:برج.

رەنگە لە هەندێك سیمای تاکە کەسی و ئاستی زانین و نەزانین و رادەی رێنوێنی و گومرایی، مرۆڤ هەبێ لە مرۆڤیکی دی جودابێ و گەلێك لە گەلێك جیاواز و نەوە لە نەوە جیابن. بەڵام مرۆڤ -بەتێکرایی، لە هەمویارە جیاکانیدا- هەر مرۆڤە. راستە ئەو جوغزەی[1] تێیدا خول دەخوا زۆر فراوانە بەشەکانیشی جوایەزن، بەڵام لە کۆتادا هەمان ئەو جوغزە مرۆڤانەیە کە لەئەزەلەوە بۆ ئەم مرۆڤە کێشراوە.

(جێگیری) بنەما و گەوهەر[2] و زاخی ژیانە و بەرەتبونی چاخ و رۆژگاران ناگۆڕی.

جا لە سێبەری ئەو بیرۆکە (جێگیر)ەدا خەڵکیش نەریتی جێگیریان بە میرات بۆ بەجێ مابو. لە نەوەیەك بۆ یەکی دی کەمێك دەگۆڕا و لار دەبو، بەڵام سەرجەم بنەما و چەمکی جێگیریان هەڵگرتبو. نەریتگەلێك کە بە پیاو و ژن و منداڵ و خێزان و کۆمەڵ و ژیان پەیوەست بون.

واش بەهەستی خەڵکی داهات کە ئەم نەریتانە لە سەر (غەریزە مرۆڤانە) چەسپاو و جێگیرەکان و ویستی خودا و لە سەر ئاین دامەزراون.

ئاینیش لە کۆڵەگە هەرە بە هێزەکانی نەریتەکان بو. چونکە وشەی خوا بۆ مرۆڤ وشەیەکی جێگیر بوو، وشەیەکی پیرۆز بو کە چاوەدێری و رێز لێنانی ئەرکی هەمو نەوەکان بو.

لە ئاینیشدا بەهای رەوشتیی دیاریکراو هەن، چاوەدێرییان حەتمییە، جا رەنگە خەڵکی کەم و زۆر لە ژیانی کردەکیاندا لێیان وە دوریکەونەوە یا لە مامەڵە و

---

١ جوغز: دائرة.

٢ گەوهەر: جوهر.

هەڵسوکەوتی تاکە کەسیاندا تەواو پشتی تێبکەن و هەندێك جار بە ئاشــکرا لێـی دەربچن، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا -وەکـو مــەبدەء- چـاودێری کردنـی ئەرکێکـە و ئەوانەی پشتیشی تێدەکەن دان بە بیانوگیری[1] و شایســتەییەکەی دادەنێــن، ئەگـەر چی لــێ لادان و دەرچونی خۆیان بە هەنجەتی جۆراوجۆر پاساو دەکەن.

هەروەها ئاین و رەوشت و نەریتەکان یەك (گرێ) و یەك ڕوگە بون و لە هەســتی وان شــتگەلێکی جێگـیر بـون و بـە گۆڕانـی کـــات نــەدەگۆڕان و روداو کـــاری تێنەدەکردن.

* * *

لە ساڵی ١٨٠٩ دا داروین لە دایــك بـو. لــە ســاڵی ١٨٥٩ کتێبـی (بنەچـەی جۆرەکان)[2]ی بڵاوکردەوە و لە ساڵی ١٨٧١ کتێبـــی (بنەچـەی مــرۆڤ)[3]ی پـەخش کرد.

ئنجا هێڵێکی ئاشکرا لە هێڵەکانی مێژو کێشرا..

چەند سەدەیەك بەر لە هــەنگی[4] کۆپــەرنیکۆس و گــالیلیۆ لــەبارەی گـەردون و چـەقبونی زەوی تێیــدا و شـێوە و سـوڕانەوەی زەوی دەگـەل کڵێســەی ئــەوروپایی تێکهەڵەنگوتن[5] ئەوەبو بە هۆی هەڵوێستەکەیان لە ئاست ئــەو فیکـرە (پـیرۆز) و (جێگیر)انەی کە کڵێسا لە هامێزی[6] گرتبون و وەك بەشێك لە بیروبــاوەڕ و یــەکێك

١ بیانوگیری: حجیة.
٢ أصل الانواع.
٣ أصل لانسان.
٤ هەنگی: ئەوکاتە.
٥ تێکهەڵەنگوتن: إصطدما.
٦ هامێز: باوەش.

لە بنچینەکانی ئاین داکۆکی لێدەکردن، ئەو دو زانایە، دوچـاری گـەلێك کێشـە و گرفت بونەوە و زۆریان ئازار و ئەشکەنجە چێشت..

جا لەوێدا تۆوی ڕق و دوبەرەکی لە نێوان زانست و کڵێسا هاتە چاندن و زانایان لە پیاوانی ئاین دورکەوتنەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەوەش چەند سەدەیەك تێپەڕین و بارەکە هەر وەك خۆی مایـەوە و جەماوەریش لە پاڵ ئاین و کڵێسا و لە ریز رەوشت و نەریتان راوەستابون.

تاوەکو داروین پەیدا بو و تیۆرێکی لە بابەت گەشەسەندن و تیۆرێکی لە بـارەی بنەچەی جۆرەکان و بنەچەی مرۆڤ بڵاوکردەوە.

لێرەدا بیروباوەڕ لە بنەڕەتـەوە و، هزرەکـانیش لـە بناغـەوە هـەژان و لـەرزیان تێکەوت.

داروین هات و گوتی هیچ شتێك لەسەر زەوی (جێگیر) نیـە: نـە ڕوەك و.. نـە گیانەوەر و.. نە مرۆڤ.

هیچ مەبەستێکی جێگیریش لە ئەفراندنێ[1] دا نیـە.. تەنانـەت هـەر مەبەسـت نیە.

وەدیهێنەریش -کە سروشتە- لەبنەڕەتدا مەبەستی نـەبوە مـرۆڤ وەدیبـهێنێ، بەڵام مرۆڤ هەر لەو گۆڕەی[2] لە ئەنجامی پرۆسێسێکی لەسەرە خـۆی گەشەسـەندن کە ملیۆنان ساڵی خایاندوە، پەیدا بوە.

(مروڤ)یش لە سەرەتادا هـەروەك ئـەمڕۆ مـرۆڤ نـەبوە.. بـەڵکو بنەچەکـەی ئاژەڵە.

١ ئەفراندن:خلق.

٢ لەو گۆڕەی: لەخۆڕا.

مرۆڤ نە قسەی دەکرد، نە عەقڵی هەبو، نە لەسەر دو پێیان دەوەستا، واتە ئەو تایبەتمەندێتیەی نەبو کە تێڕوانینە ئاینیەکە بە باڵای دابڕیوە.. تەنانەت (گیان)یشی نەبو.

ئاژەڵ..

ئەوەبو ئەو تیۆرە تێکڕای کۆمەڵگەی ئەوروپایی هەژاند و کڵێساش قیامەتی ڕابو.

کڵێسا گوتی: داروین بێبڕوا و خوانەناسە. داروینیش گوتی: پیاوانی ئاین خەڵەفاون.

ئنجا جەنگێکی توند بەرپابو و، تاکو زۆران بیروباوەڕ دارمان و خۆڵیان بەسەردا کرا، کۆتایی نەهات.

لە سەرەتا جەماوەر لەپاڵ کڵێسا راوەستابو، پاڵپشتی ئەو بیروباوەڕەی دەکرد کە ئەگەر چی کاریشی پێنەکرد، بەڵام لای خۆشەویست بوو.. لە پاڵ نەریتە روحی و فیکریەکاندا بوو.. لە پاڵ کەلەپورە عەقڵی و ویژدانیەکە و.. لەپاڵ شانازی بە کەسێتی خۆ و.. شانازی بە بنەڕەتە (مرۆڤانە)کەی خۆی، کە داروین ئەو مرۆڤایەتیەی لێ داشۆری و خستیە ریز ئاژەڵان.

بەڵام دواتر هەڵوێستی جەماوەر گۆڕا...

ئەگەر چی زۆر پێی ناخۆش بو کە داروین مرۆڤایەتیەکەی لێ داماڵێ و بنەچەکەی بۆ ئاژەڵان بگەڕێنتەوە، بەڵام دەستی دایە داشکاندنی کڵێسا و پیاوانی دین و هەڵێکی چاکی بۆ رەخسا بۆ دەربازبون لە کۆیەرانی[1] قورس و گران و دەسەڵاتی قێزەون و رەزاگرانی کڵێسا.

---

[1] کۆیەران:نیر.

لە سەدەکانی نێوەڕاست کڵێسا تەواو گۆڕابو، ماکی بەزەیی فراوان و روحانیەتی بێ پەڵەی مەسیحیەتی تیانەمابو. ببوە دەسەڵاتێکی دنیایی ملکەچکار و زەبونکار و گەلێك جۆر سەرانەی لە ماڵ و روح و فیکری خەڵك دەستاند و باجی قورس و دەیەکی[1] داهاتی دەکردە باری سەرشان و ملیان، هەروەکو بە زۆر سەرشۆڕ و ملکەچی پیاوانی ئاینی دەکردن و بیروبۆچونی دیاریکراوی بەناوی وتەی ئاسمانی بەسەردا دەسەپاندن و هەرکەسێکی دەگەڵیاندا کۆك نەبا و بەر ئەمر نەبا خوانەناس و بێ ئیمان بو.

جەماوەر دەرفەتێکی دۆزیەوە کە تیایدا خۆی لەو دێوە ناشرینە ڕەهاکا کە لە خەو و وەئاگایی راوی دەنێ. جا ئەو هەلە رەخساوەی قۆستەوە و وەك هێرشبەر هاتە مەیدانی جەنگ، پاش ئەوەی لە حاڵەتی بەرگری دابو، بەدار و پەردوی بیروباوەر و هزر و (گیان)ی داڕوخا و کڵێسای بەرد باران دەکرد.

جا سروشت و هۆکارەکانی جەنگەکە هەر چۆن بن و هەر چی بن، ئەوا یەکێك بو لە جەنگە یەکلاکەرەوەکانی مێژو کە گەلێك دەرەنجامی زۆر ترسناك و ترکەزەی لە ژیانی خەڵکی بەجێهێشت و بەردەوام تا ئێستاش ئەو (هەڵکشان)ەی لە ژیانی ئەوروپادا دایهێنا ترسناکترین شت قەیدەکاتەوە[2]

یەکەم دەرەنجامی لەرزینی بڕوابونە بە خودا و بە عەقیدە.

دوەم دەرەنجامیشی لەرزینی بڕوابونە بە مرۆڤایەتی و مرۆڤ و بەرزی و باڵایی و رۆحانیەتی مرۆڤ.

١ دەیەك:عُشر.

٢ قەیدەکاتەوە:دەڕشێتەوە.

سێیەم دەرەنجامیشی لەرزینی بڕوایــە بــە (جێگــیری) هــەر سیســتەم و بــەهاو هزرێك.

چوارەم و پێنجەم و شەشەمیش.. لــەرزینی هەموشــتێك کــە پێشــتر لەنگــەری گرتبو، لەگەڵ وێران و کاولکردنی هەمو بنیاتێکی بناغە چەسپیو.

بیرۆکەی خودای وەدیهێنەری رێکخەری کاران و خودان ویست و مەبەســت، لــە سەردەستی داروین لە دۆزی ئەفراندنی مرۆڤدا دوچاری یەکــەم هــەژانی راســتەوخۆ بۆوە. کاتێك داروین نەرێی لەبونی مەبەستی خودا کــرد و ئــەوەی رەتکــردەوە کــە مرۆڤ راستەوخۆ بەدەستی خودا وەدیهێنرابێ، بەڵکو بونی مرۆڤــی بــۆ پرۆسێســی گەشەسەندن گێڕایەوە، ئەوەشی نەسەلماند کە لە قەوارەی مرۆڤدا شتێك هــەبێ کــە (خوا لە گیانی خۆی فوی پێــدا کردبــێ)، ئــەوەبو بــە شــێوەیەکی گردەبــڕ بڕیــاری حەیوانی بونی رەهای بنەچەی مرۆڤی راگەیاند.

جا لێرەوە دیندارەکان پاش جەنگێکی توند کە کاری خۆی لــە ویژدانیــان کــرد، ناچار بون -ئەگەر هەر دەرفەتیان نەبو- ئەوا وەکو بیرۆکەیەکی ویژدانی نــالۆژیکی دور لە واقیع.. واقیعی زانستی و واقیعی کردەکی[1] و واقیعی ماتریالی (مــاددی)، بڕوا بە خودا بهێنن.. باخودا بیرۆکەیەك بێ ویــژدان تێرکــا و گیــان بەهۆیــەوە لــە ڕامانەکانیدا مەلەبکات، بەڵام خودا -پاکی بۆوی- تێکەڵی پرۆسێسی ئەفراندن و یاساکانی سروشــت و بــەڕێوەچونی کاروبــار لەســەر زەویــدا نیــە. یــان ئــەوەتا ـ ئەوپەڕی- گەردونی وەدیهێناوە و سونەت و توانستەکانی تیاداناوە و جا لێگــەڕاوە گەشە بکا بەو شێوازە کە توانستی گەشەسەندن هەڵیدەگرێ، بەبێ ئــەوەی خــودای مەزن تێکەڵ بە دەرەنجام و ئیرادەبێ.

---

١ کردەکی:عملي.

بەڵام ئەو کەسانەی دیندار نەبون.. ئەوانەی دینـــداری ببـوە کۆڵێـك بـەحوکمی نەریتەکان و دەسەڵاتی کلێسا و پیاوانی ئاین لــە ملیـان هـاڵابو.. لـە تێورەکـەی داروین ئەو دەرفەتەیان دەسکەوت کە لــە دەسـت سـەرپاکی ئـاین ڕابکـەن و بـوە مایەی دەربازبونیان لە هەمو کۆت و بەندەکانی. جا کـاتێك بەرابـەر ئـەو گرفتـە بونەوە کە دوچاری هـەمو عـەقڵێکی بـڕوادار و بێـبڕوا دەبێتـەوە: گرفتـی یەکـەم وەدیهێنان و دامەزرانی ژیان لە سەر زەوی، ئـەو کاتـە لـە (خـوا) هـەڵاتن بـەرەو (سروشت) کە داروین لە بارەی دەیگوت: (هەمو شتێك وەدیدەهێنێ و.. تواناکانی بێ سنورن ). بەم شێوەیە سروشت بۆ ئەوان بوە خواوەندێکی دیکە و دەیانپەرەست. خواوەندێك زۆربەی سیفەتەکانی خوایان دابوە پاڵ، بێجگە لە مەبەسـت و ویسـت. سەرەڕای ئەمەش خودایەك بو کلێسەی نەبو بۆ سەرانە و باج خەڵك ڕاو بنـێ و بـە گیروگرفتان مێشکیان سەرگەردان بکا و بنەماکانی رەفتـار و رەوشـتیان بەسـەردا فەرز بکا. کەواتە سروشت خودایەکە خەڵکی بە پاکژی پابـەند ناکـا و بـەندەکانی دەتوانن لە کۆت و پێوەندان بەرەڵابن.

ئەمەش تاکە بومە لەرزەی بیرۆکەی بیروباوەڕ نەبو..

بیرۆکەی (گەشەسەندن) بەهزر و ویژدانی خەڵکیدا داکشا و ڕۆچو، ئەو شـوێنەی داگیرکرد کە پێشتر بیرۆکە (جێگیری)ی لێبو.

جا مادام هەموشتێك گەشەدەستێنێ و هیچ شتێك لە حاڵی خۆیدا نـامێنی - وەك داروین دەڵێ- ئەدی بۆچی بیرۆکـەی گەشەسـەندنی خـودی خـودا و بیرۆکـەی بیروباوەڕیش ناگرێتەوە؟

تەنانەت لە خولگەی مێژودا بەڕاستی بیروباوەر گەشەی کردوە.. ئەوەبو زانایـان لە (دۆزینەوەیەکی نوێ) لە جیهانی ئایندا وەئاگا هاتن.. لەئاییندا مەسـەلە هـەر ئەوە نەبوە کە لــە گومڕایـی بتپەرسـتیەوە بـۆ بیروبـاوەڕێکی جێگـیری ڕوەو خـوا

هاتبێ، بەڵکو بیرۆکەیەکی (گەشەسەندو)بوە و بە پەرستنی باوك دەستی پێکردوە، پاشان هاتۆتە سەر پەرستنی تۆتەم[١] و ئنجا پەرستنی بت و پاشان پەرستنی خودا و بروا بە سروش و پەیام. سـبەینێش.. یاشەمرۆ.. بیرۆکەکـە لـە بناغـەوە (گەشـە دەستێنێ)، باوی خواپەرستی نامێنی و.. بۆ نمونە دەبێتە پەرستنی سروشت یا هەر پەرستراوێکی دیکە.. یان.. هیچ جۆرە پەرستنێك لە گۆڕێ نامێنێ!

جگە لەمەو لەویش ڕێبازیکی عەقڵی پەیدا بو کە بـەلای بـێ بـاوەڕی تـەواودا دەشکایەوە و تەنیا باوەڕی بەو شتانە هەبو کە ئەزمون دەیسەلمێنی یا دەکەونە بەر هەستەکان..

جا خەڵکی بـەخۆیان دەگـوت -یەکـەمجار (زانایـان) بـەخۆیان گـوت و پاشـان جەماوەر شـوێنیان کـەوتن- پێشـتر بڕوامـان بـە شـتگەلێکی زۆر هـەبو کـە لـە باپیرانمانەوە بە کەلەپور بۆمان جێمابو یان کلێسا و پیاوانی دیـن لـە گوێچکـەیان ئاخنیبوین، ئەوەش (سەلما) کـە راسـت نـەبون، کلێسـا دەیگـوت زەوی نێوەنـدی گەردونە، سەلما کە ئەمە راست نەبو، هـەروەها دەرکـەوت کـە زەوی خـڕە کـەچی کلێسا دەیگوت: پانوپۆڕە. هەروەك سەلما کە مـرۆڤ لـە بنەچەیـەکی حەیوانیـە و کلێساش پێشتر دەیگوت: خودا بەشێوەی خـۆی ئەفراندویـە، وەك وەدیـهێنراوێکی تازە کە پەیوەندی بە هیچ شتێکی پێشەخۆی یـان پاشـە خـۆی نیـە.. کەواتـە بـا سەرجەم ئەو بیروباوەڕە جێبێڵین کە بە میرات بۆمان جێماوە چونکـە لـە کۆمەڵـە پڕوپوچێك پێکهاتون. با لە نوێوە دەست پێبکەین بێ بیروباوەڕی پێشو. بێ هـەمو هزرێکی بەڵگە نەویست. با لە خاڵی سیفرەوە دەست پێ بکەین.. تەنیا بـڕوا بـەو شتانە بێنین کە بە چاوانمان دەیانبینین ویە هەست و ئەزمونمان پەیان پـێ دەبـەین.. دەبا بیرۆکەی خودا و دەست تێکەڵ کردنـی ویسـتی لـە وەدیـهێنان لـە زەینمـاندا وەلانێین. با بە شێوەیەکی جیا لە خوا بونەوەر بتۆژینەوە. چونکە خودامان نەدیوە

و نەماندیوە چۆن تێکەڵی گەردون بوە. با خودا بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ بڕوابێنن هەر لە خەیاڵدا بمێنێتەوە. بەڵام ئێمە -کە واقیعین- بڕوا بە شتێك ناهێنین نەکەوتە بەر هەستەکان.

ئا بەمجۆرە بیرۆکەی دین کەوتە هەژان.

هەرچی (مرۆڤ)یشە هەمو تێڕوانینێکی ئاینی لە دەستدا کە بەرزێتی و تاکێتی و رۆحانیەت و ئەخلاقیەتی بە باڵادا پۆشیبو و هەمو بۆ فوپێداکردنی خودا لە روحی خۆی و مەبەستی هەمیشەکی لە وەدیهێناندا خۆیان دەدیتەوە. داروینیزمیش ئەم دوانەی بە پڕوپوچی دەسکردی ئەفسانان دانابو و ئەو (پیرۆزی)یەشی لە مرۆڤ داماڵی کە لەوە وەدەستی هێنابو خوا بەشێوەی خۆی وەدیهێناوە و گرنگی پێداوە و زۆر سیما و تایبەتمەندێتی تەنیا بەوی بەخشیوە. بەتایبەتی ئەو روحانیەتە رونەی کە لە ئاژەڵانی دیکە دایدەبڕی و بەرزی دەکردەوە. جا مرۆڤ بەپێی رێنوێنیی داروینیزم بوە ئاژەڵێك نە بەرزی تێدا نە روحانیەت، هەروك لە لایەکی دیکەش لە هەمو بنچینەکانی رەوشت و کۆمەڵگە و نەریتان رەهابو، چونکە ئەو هەمو (جێگیر)انە ساختەن و جێگیرنین و لەو گومراییە سەریان هەڵداوە کە لە ئاین هەڵێنجرابون.

هەموشتێك دەگۆڕێ. هەروەها کۆمەڵگەش دەگۆڕێ.. سیستەم و هزر و چەمکەکانی دەگۆڕێن.

جا ئەگەر (رەوشت) بە چەمکە باوەکەی لە رابردودا شتێکی جوان بوبێ و بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندن گونجاو بێ، مەرج نیە ئەمڕۆش هەر جوان و گونجاو بێ.. چونکە کۆمەڵگە گۆڕا... هەر (کۆمەڵگە)ش بوە پێشتر ئەم رەوشتەی دروستکردوە... نەك خودا و... نەك بیروباوەڕ -هەرچەندە لە پێشودا خەڵك لە

بێئاگایی خۆیان دابوویانە پاڵ خودا و بیروباوەڕ- واتە کۆمەڵگە خاوەن بڕیـارە کـە دەستکاری بکا یان وەکو خۆی بیهێڵێتەوە... بڕیاریشی داوە دەسکاری بکا.

ئەگەر (خێزان) بە چەمکە باوەکەی لـە رابـردوودا شـتێکی جـوان بویـێ و بـۆ قۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندن گونجاوبێ، مەرج نیـە ئـەم چەمکـە ئـەمڕۆش گونجاو و جوان بێ.. بەڵکو هەر پێویست نیە بەهیچ جۆرێك خێزان هەبێ... چونکە خودا خێزانی دروست نەکردووە هەروەك جەماوەر پێشـتر بـە هەڵـە تێگەیشـتبون، بەڵکو پێداویستەکانی کۆمەڵگە ئەوەی خواستبو... ئەمڕۆکەش کۆمەڵگـە ئـازادە کـەوا خـێزان بهێڵێتـــەوە یـــاخود لێکـــی هەڵوەشـێنێ... ئێســـتاش بڕیـــاری هەڵوەشاندنەوەی داوە.

ئەگەر لە پێشودا ئافرەت تەنیا ژن و دایك بوبێ، ئەوە یەکێك نیە لـە بنـەرەتی شـتەکان، رێبـیرێکی[1] جێگـیر نیـە کـە نـەگۆڕێ... بـەڵکو ئەمـــە بیرزایـــەکی[2] کۆمەڵایەتیە لە چەند هۆیەك پەیدا بوە.. ئەو کۆمەڵگەیەی پێشتر ئـەم بیرۆکەیـەی بە پەرژینێك بۆ پاراستن، بەڵکو بە پیرۆزیەکی ساختە دەورە دابـوو، نـاوی خـودا و دینی تێهەڵقوتاند بو، هەر ئەو کۆمەڵگەیـــە ئـەمڕۆ ئـەم بیرزایـە وێـران دەکـا و پەرژینە ساختەکەی هەڵدەتەکێنێ و بەرەڵا و بێ شورەی دەهێڵێتەوە.

ئەگەر (داوێنپاکی) یەکێك بێ لە پیرۆزیەکانی رابردو، بە هیچ جۆرێك لە ژیانی مرۆڤایەتی بەهایەکی جێگیر و رەگاژۆ[3] نیە... بـەڵکو ئەمـە تـەنیا بـۆ ماوەیـەك وابو... هیچ شتێك رێ لەوەناگری کە لە بناغەوە (بگۆڕێ) یا گەر کۆمەڵگە بیەوێ ببێتە عەیبەیەك و شارستانان خۆی لـێ دورکەن.

---

1 رێبیر: مبدأ.
2 بیرزا:فکرة.
3 رەگاژۆ:راسخ.

بەم شێوەیە بیرزای رەوشت و نەریتان لەرزەی تێکەوت.

ئەوەی قورەکەی تیرتر کرد و بومەلەرزەکەی توندتر کرد ڕوخانی ئەو بەربەستە هەرە گەورەیە بو کە پێشتر بریتی بو لە بڕوا بە بەرزێتی مرۆڤ و روحانیەتەکەی، لەگەڵ شەرمکردن لەوەی (دابەزێتە) ئاستی ئاژەڵ، بە لەبەر چاوگرتنی ئەوەی کە مرۆڤ وەدیهێنراوێکی ناوازەیە و ژیان و کردەوەی بە پێوەری ئاژەڵان ناپێورێن و نابێ غەریزە و ئارەزوەکانی بۆ کوێیان هاژوا ڕەگەڵیان کەوێ... جا ئەمڕۆ ئەو بەربەستە لاکەوت... بەربەستی (مرۆڤایەتی)، مرۆڤیش لە عورفی دەرونی خۆیدا بو بە ئاژەڵێك تا بن هەنگڵ لە بنەچەی ئاژەڵانەی خۆیدا رۆچوە. کەواتە ئەو لە ئاستێکی (بەرز) نەبوە تا لێوەی (دابەزێ)... بەڵکو بەردەوام لە (دۆخ)ێك دایە دەیگەیەنێتە دۆخێکی دیکە... هەڵکشان و داکشانیش لە پێوەری ئاژەڵدا نیە.

* * *

لەگەڵ داروینیش راڤە کردنی ماددی و ئابوری بۆ مێژو هاتەکایەوە. راڤە کردنی ماددی مێژو دەڵێ، یەکەم: مێژوی مرۆڤایەتی بریتیە لەمێژوی گەڕان بە دوای خۆراکدا.

دوەم، دەڵێ: هێزە ماددیەکان[1] -یا هێزە ئابوریەکان- ئەوانەن کە ژیانی مرۆڤایەتی رێکدەخەن و مۆرکی خۆی پێدەبەخشن و هزر و چەمك و بیروباوەڕەکانی دادەمەزرێنن... بە پێی پلەو ئاستی گەشەسەندنیان. جا کە مرۆڤایەتی لە قۆناغێکەوە چوە یەکێکی دی -بە حوکمی ئەو هێزی گۆڕانە بەردەوامەی لە دەرەوەی خودی مرۆڤ بە سەریدا فەرزکراوە و هیچ پەیوەندی بە ویستی خودی مرۆڤەوە نیە- ئەوا وێنەی ژیان دەگۆڕێ و هەستەکانی خەڵك دەگۆڕێن و هەمو

---

[1] هێزە کەرەستەییەکان: القوی المادیة.

شـتێکیش لـە کۆمەڵگـەدا، وەك رەوشـت و داب و نەریتـەکانیان هـەر گۆڕانیـان بەسەردادێ، کەسیش دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ چونکـە دەسـکردی مـرۆڤ نیـە، بەڵکو دەسکردی دەوروبەری ماددی و هێزی ئابوریە[1]

سێیەم، دەڵێ: ئەو دۆخانەی مرۆڤایەتی پێیدا دەڕوا هەر بە خۆیان دۆخگەلێکی حەتمین لـێ دەرباز بون و تێ هەڵبژاردنیان نیە.

بۆ نمونە لە ڕاوەوە دەچێتە شوانکارەیی و لەمەوە بۆ کشتوکاڵ و لەمیشـەوە بـۆ پیشەسازی... دیسان بۆ نمونە لە ئەفسانەوە بۆ دینداری و... لەویشەوە بۆ زانست، هەر دۆخێکیش لەمانە کۆمەڵە بیروباوەڕ و دابونەریتێکی دیاریکراویان هەیـە کـە ژینگە وێنەیان دەکێشێ... کاتێکیش کۆمەڵگە لە حاڵەتێکەوە دەچێتە حاڵەتێکی دوای خۆی -کە ئەمەش گواستنەوەیەکی حەتمیە- ئەوا بە شێوازێکی حەتمی و بێ سەر پشك بون هەمو چەمك و هزر و بیروباوەڕەکانی حاڵەتە نوێیەکە وەردەگرێ.

لە دواییشدا دەڵێ -کە ئـەویش پوختـەی قسـەی پێشـوە-: هـزر و هەسـت و بیروباوەڕەکان نین کە خەڵك دەجولێنن و رەفتاری کردەکیان لە واقیعـی ژیـاندا بـۆ دەکێشن، بەڵکو ئەمانە بەدوای هەمو بارێکی کۆمەڵایەتی یان ئابوری دادێن. واتە هێزی ئاراستە کەر نین، سەرەڕای ئەمـەش لەیـەك حاڵـەتدا جێگـیر نـابن، بـەڵکو بەردەوام بەرەو پێش دەچن.

مارکس دەڵێ : ((لەو بەرهەمهێنانـە کۆمەڵایەتیـەی خـەڵکی پێـوە خەریکـە دەیانبینێ پەیوەندیگەلێکی دیاریکراو دروست دەکەن کە ناتوانن دەسبەرداریان بـن و لەویستی ئەوانیش بەدەرە.. چونکە شێوازی بەرهەمـهێنان لـە ژیـانی مـاددیدا سنور بۆ چۆنیەتی کردارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و گوزارەییەکان لە ژیاندا دادەنێ، هەستی خەڵك نیە کە بونیان دیاری دەکـا، بـەڵکو بونەکەیانـە کـە هەسـتەکانیان دیاری دەکا)).

هـەروەها (فرێدرێـك ئـەنگلز)دەڵـێ: ((تیـۆری مـاددی لـەم ڕێبـیرەوە دەسـت پێدەکات: بەرهەمهێنان و ئەو شتانەی لەگەڵیدان لە گۆڕینەوەی بەرهەمـەکان ئـەو بناغەیەن هەمو سیستەمێکی کۆمەڵایەتیان لەسەر بنیات دەنرێ، جا بـەپێی ئـەم تیۆرە دەبینین نابێ لە ئاوەزی خەڵکی یـان لـە گـەڕانیان بـە شـوێن حـەق و دادی هەمیشـەکی بـە دوای دوایـین هۆکارەکـانی هـەمو گۆڕانکاریـە بنچینەییـەکاندا بگەڕێین، بـەڵکو لـەو گۆڕانکاریانـەدا بـەدواياندا دەگـەڕێین کـە بەسـەر شـێوازی بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕکردن دادێ)).

جا ئێمە لێرەدا گفتوگۆ لەبارەی راوبۆچونەکان ناکەین، بـەڵکو مێـژو دەخەینـە ڕو[1]

ئەم لێکدانەوە ماددیە بۆ مێژو لە نێو لێکدانەوەی ماددی ئاژەڵانەوە بۆ مـرۆڤ درێژەی کێشا.

چونکە مرۆڤ بۆ رەواو و دادی هەمیشەکی کۆشش ناکات، بـەڵکو بـۆ خـۆراك تێدەکۆشێ.

نە بیروباوەڕ و نەڕێبر و نەبەهای بەرز و نە هەست و نەست.. بەڵکو ئاژەڵێکە لە چوارچێوەی گەدەدا دەژی و... گەڕان بە دوای خۆراکیش دەیخاتە گەڕ.

خو ئەگەر بۆ ڕەوا و دادیش تێکۆشا سودی نیە.. چونکە خەڵك لەبـەر حوکمـی دو یاسای حەتمین کە ماددە و ئابوریە.

(هەستی خەڵکی نیە کە بونیان دەسازێنی، بەڵکو بونیانە کە هەسـتیان دیـاری دەکا).

ئەگەر خەڵك بیرۆکەیەك لە خۆیگرن یا خود بڕوا بە بیروبـاوەڕێك بێنـن، بـەهای نیە و ئەمانە هەموی بەتاڵن، تێکڕا ئەندێشە و خەیاڵن، ئەبناگوێ ئەستور دەکەن،

نەبرسی و لاتان تێردەکەن. ئەمانە هیچ لە (واقیعی ژیان) ناگۆڕن، ئەو واقیعەی کە (شێوازی بەرهەمهێنان) سنوری بۆ دادەنێ.

ئاین و رەوشت و نەریتەکان بەخۆیان و لە خۆیانڕا چ بەها و قیمەتیان نیە. بەڵکو تەنیا ڕەنگدانەوەی باری کۆمەڵایەتی و ئابوری بەرپای نێو کۆمەڵگەن. لەمەش زیاتر و گرنگتر ئەوەیە کە جێگیریش نین. بەڵکو بە گۆڕانی شێوازەکانی بەرهەمهێنان دەگۆڕێن. لەمەش زیاتر و گرنگتر ئەوەیە کە مرۆڤ بە خۆی دەگۆڕێ و جێگیر نیە. قەوارەیەکی نەگۆڕنیە ناوی مرۆڤ بێ.. هیچ غەریزە و پاڵنەرێکی فرچکیش[1] نین.. مرۆڤ رەنگدانەوەی ژینگەیە، نەك تەنیا لە چەمك و بیروباوەڕ و ڕاهاتەکانی، بەڵکو لە قەوارەی دەرونی ناوەکی خۆشیدا. هەمو بەشێك لە دەرونی لە بۆ گۆڕان ئامادەیە. پەیوندیەکانی تاکانە و نێوکۆمەڵ و سێکسیش[2] لەگەڵ موڵکداری و هاوسەرداری و خێزانیشدا.. هەمو شتێك.. هەمو شتێك ڕەنگە گۆڕانی بەسەربێ. پێوەرێکیش نیە هیچ شتێك بپێوێ بێجگە لە ڕادەی گونجانی لە گەڵ دەوروبەرەکەیدا.. ئەوجا پێوەری نەگۆڕیش هەر بونی نیە.

* * *

کاتێك (فرۆید) دەرکەوت. هێشتا ئەو شەپۆڵە توندە هێور نەببۆوە کە تیۆری داروین دروستی کردبو، تەنانەت هێشتا نەگەیشتبوە ئەو پەڕی.

فرۆید لە ساڵی ١٨٥٦ لە دایك بو.. واتە نێزیکەی نیو سەدە پاش داروین.

هەروەها بە چاوپۆشین لە ڕادەی دڵسۆزی و لێبڕانی بۆ زانستەکەی یا بۆ جولەکاتیەکەی[1] فرۆید گەلێك کەوتبوە بەرکاریگەری تیڕوانینی داروینیزم بۆ

---

١ فرچك: فطرة.

٢ سێکس:الجنس.

مرۆڤ، لە واقیعیشدا درێژبونەوەیەکی بەهێزی داروینیزم بو لە بــواری تۆژینــەوەی دەرونی و شیکاری دەرونزانی.

فرۆید هات هەڵسوکەوتی مرۆڤانەی لەسەر بنچینەی حەیوانێتی ڕەهای مــرۆڤ لێکدایەوە، کە هیچ سایەکی بۆ (مرۆڤایەتی) و باڵایی و جودایی مرۆڤ تێدا نەبو. هات و دەیگوت: (سێکس) بە واتای تەواو و ئاژەڵانــەی، بــە واتــای بەرهەســت و هەوەستی، بەمانای جوڵــەی جەســتە و هەســتەکانی جەســتە، یەکــەمین گــەڕێن و پاڵنەری ڕەسەنی قەوارەی مرۆڤانەیە.

سێکس هەمو شتێکە و هەمو شتێکیش لە (سێکس)ڕا هەڵدەقوڵێ.

منداڵ بە چێژێکی سێکسی مەمکی دایکی دەمژێ و بە چێژێکی سێکسی میز دەکا و دەڕی[1] و ماسولکەکانی بە چێژێکی سێکســی دەجوڵێنــێ و.. بــە چێژێکــی سێکسی بە دایکیەوە پەیوەست دەبێ (هەروەك کیژۆڵەش بە هەستێکی سێکسیەوە بە باوکی پەیوەست دەبێ)، جا ئەو هەستە سێکسیە بەرامبەر دایك (یان باوك لــە حاڵەتی مێینەدا ) لەپاڵ گەشەی منداڵەکە گەشە دەکات. هەتا یەکەم گرێکوێــرە لە ژیانیدا دروست دەکات، کە گرێکوێرەی ئۆدیبە (یان گرێکوێرەی ئەلێکترا ئەگەر منداڵەکە کچ بێ) و لە ئەنجامی ململانێی منــداڵ دروســت دەبــێ لــە نێــوان ئــەم عەشقە سێکســیەی بــۆ دایکــی و دەســەڵاتی سێکســی بــاوکی بەســەر دایکییــدا (بەپێچەوانەش لە حاڵەتی مێینــەدا) جــا بــەردەوام ئــەم گرێیــە کــار لــە دەرونــی منداڵەکە دەکا و ئەشکەنجەی دەدا هەتا بە شــێوازێك خــۆی لــێ دەربــاز دەکــا.. لەلایەك بەشێوازی خامۆشکردن و لە لایەکی دیکەش بە پۆشــینی کەســێتی بــاوك خۆی لــێ دەرباز دەکا.

---

[1] دەڕی:تبرز.

جا کاتێك منداڵ هەستی سێکسی خۆی بەرامبەر دایکی خامۆش دەکاو، -لەنەستیدا- شوێن و جێی باوکی وەردەگرێ و کەسێتیەکەی دەپۆشێ، گەشەی دەرونی ئەو کاتە دەست پێدەکا و بەخۆی هەستە ناوەکیەکانی خۆی خامۆش دەکا و فەرمان و بەربەستگەلێکیش بەسەرخۆیدا دەسەپێنێ کە لەو کۆمەڵەی دەوری داوە هەڵیان دەمژێ و بەرەبەرە دەست بەسەر هەڵسوکەوتی خۆی دادەگرێ. فرۆیدیش بە دامەزرانی (خودی باڵا)[1] یا دامەزرانی ویژدان گوزارش لەمە دەکا. بەڵام ئەم پرۆسەیە بە پێی قسەی فرۆید پرۆسەیەکی ترکزەیە، تەنانەت لەگەڵ وابەستەبونی بە پێگەیشتنی دەرونی منداڵ[2]، چونکە ئەو خامۆشکردنە سێکسیەی لەتەك گرێی (ئۆدیب) دایە، شوێنەوار گەلێکی زیانمەند لە دەرونی مرۆڤدا بەجێدێڵێ، چونکە ئەمە لە سەر رێی هێزی زیندەگی هەڵقولاّ و رادەوەستێ و بەربەست و کۆت دروست دەکات. ئەمەش دەبێتە مایەی لارێ بونی دەرونی و گرێکوێرەی نەخۆشی و شپرزەیی دەمارەکان و لەکۆتاییدا قەوارەی مرۆڤانە دادەرمێنێ.

جا ئەم لێکدانەوە سێکسیە بۆ هەڵسوکەوتی مرۆڤ تەنیا لێکدانەوەی هەڵسوکەوتی تاکەکەسی نیە. بەڵکو لەگەڵ ئەمەشدا هەر لە سەرەتای مێژوەوە خولێنکی[3] سەرجەم ژیانی کۆمەڵایەتیە و تاك و خێزان و خێڵ و هۆز و کۆمەڵ و هەمو کۆمەڵگە دەگرێتەوە، هەروەك ئاین و رەوشت و نەریت و هونەر و هزر و فەلسەفە و.. هەمو چالاکیە مرۆڤایەتیەکان دەگرێتەوە، داروین لە پێشا گوتبوی:

---

١ خودی باڵا: الذات العليا.

٢ فرۆید لە کتێبی Three contributions to the sixual theory دا لە لاپەرە ٨٢ دەڵێ: (بەمجورە مرۆڤ هێزێکی گەورەی دەستدەکەوێ لەئامادەباشی دەرونی ئەمەش بۆ خۆی ترکزە و خەتەرناکە ).

٣ خولێنك: تەوەر.

لە جیهانی چێڵاندا[1] جوانەگایە جحێڵەکان رادەپەڕن و دەیانەوێ سواری دایکی خۆیان بن، بەڵام دەسەڵاتی باوك کە بەسەر گاڕانەکەدا زاڵە، رێیان لێدەگرێ. ئەوجا جەنگێکی گەرم لە نێوان ئەو جوانەگایانە و پیرەگای باوکدا دەقەومێ، کە تێدا هەمو جوانەگاکان دژی بابیان دەبنە لایەك تا دەیکوژن. پاشان خۆشیان تێك بەردەبن، هەریەکەو دەیەوێ دایکەکە تەنیا بۆخۆی بێ، جا بێهێز و لاوازەکان لەنێو ئەو جەنگەدا دەمرن یاخود پاشەکشێ دەکەن وتەریك دەبن. جوانەگایەکی جحێلیش دەمێنێتەوە، دەست بەسەر دایکەدا دەگرێ و دەبتە سەرکردەی گاڕانێ.

فرۆید هات ئەم چیرۆکەی لە داروینەوە گواستەوە، بەڵام وەکو گوتمان لەژێر کاریگەری دیدی ئاژەڵانە بۆ مرۆڤ لە جیهانی گیانەوەرانەوە بۆ جیهانی مرۆڤی گواستەوە، ئەو پیرۆزیەشی لە مرۆڤ داماڵی کە پێشتر بەهۆی تاکەڕایی[2] و جودایی لە جیهانی ئاژەڵانەوە هەیبو. هات و گوتی: لە نێو مرۆڤانی سەرەتاش هەمان بەزمی جیهانی مانگایان، جیهانی ئاژەڵان رویداوە.

کوڕەکان هەستیان بە ئارەزوێکی سێکسی کرد بەرامبەر ئەو دایکەی کە لێی بوینە، بەڵام دەسەڵاتی باوك رێی ئەو ئارەزووە بەتینەی لێدەگرتن. جا کوڕەکان پیلانی کوشتنی باوکیان دانا تا لە دەسەڵات و زاڵبونی رزگاربن و داکیان بۆخۆیان وەدەست بێنن..

ئەوەبو نەخشەکەیان جێبەجێ کرد و بابیان کوشت.

بەڵام هێشتا دەستیان بەخوێنەکەی تەڕبو، پەشیمانی دایگرتن و هەستیان بە گوناهکاری کرد، بڕیاڕیان دا یادی ئەو باوکەی کوشتبویان پیرۆز راگرن.

---

١ جیهانی چێڵان: عالم البقر.
٢ تاکە ڕایی: الفردیة.

بەمشێوەیە پەرستنی باوك سەریهەڵدا.

لەپاشاندا کەسێتی باوك لە هەستی ئەوان تێکەڵ بەهەندێك جۆری ئاژەڵان بو - ئەمەش کردارێکی دەرونیە و فرۆید دەڵێ کە سروشتیە- ئەوجار ئەو ئاژەڵانەیان پیرۆز راگرت و کوشتنیان قەدەغەکرد، بۆ سڕینەوەی تاوانی کوشتنی باوکیان و لە پێناو پیرۆز راگرتنی یادگاریەکەی. بەمشێوەیە ئاینی تۆتەمی سەریهەڵدا.

پاشان فرۆید دەڵێ: ((هەمو ئەو ئاینانەی لە دوای ئەوەدا هاتون کۆمەڵە هەوڵێك بون بۆ چارەسەری هەمان گیروگرفت -هەستکردنی کوڕەکان بە تاوانباری- ئەو ئاینانەش بە گوێرەی ئاستی ئەو ژیارانەی تیایاندا دەرکەتون ئەو ئامرازانەی بەهۆیانەوە پیادەکراون لە یەکدی جودان، بەڵام هەمو یەك ئامانجیان هەبوە و ئەویش کاردانەوەی هەمان کارەساتی مەزن -کوشتنی باوك- بوە کە ژیاری لێوە دامەزراوە و لەوەتەی ڕویداوە چرکەیەك حەسانەوەی بۆ مرۆڤایەتی نەهێشتۆتەوە))[1]

ئەمە لە بارەی ئاین.

لە بارەی رەوشتیش دەڵێ: ((رەوشت مۆرکی توند و تیژی هەڵگرتوە، تەنانەت لە پلە سروشتیە ئاساییەکانیشیدا))[2]

هەرچی ژیاریشە، ئەوا لە لاپەرە ٨٥ی کتێبی (The Ego &The Id) لەبارەی: (ناکۆکی نێوان ژیار و گەشەی سەربەستی وزەی سێکس) دەدوێ.

لەهەمو کتێبەکانی دیکەشی کە ئەم پیاسە خێرایە بە پایانیان ناگا[3]، هەمو جۆرە چالاکیەکانی مرۆڤ بەدیدی خۆی بۆ بنەڕەتە سێکسیەکەی دەگێڕێتەوە، ئەوجا ناکۆکی نێوان: هەمو رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان و ئەوەی ناوی ناوە (گەشەی سەربەستی وزەی سێکس)، ڕاڤە دەکات.

ئێمەش لێرەدا وتوێژ لە ڕاو بۆچونان ناکەین بەڵکو مێژو دەخەینەڕو.

ئەوەبو ئەو شەپۆلە گەورەیــە کــاری خــۆی کــرد و وەکــو ئــاگری نێــو پــەلاش[1] بلاوبۆوە.

بلاوبۆوە و لەگەڵ خۆیدا ئاین و ڕەوشت و نەریتی دەڕوخاند و تێکڕای کەلەپوری مرۆڤایەتی پیس دەکرد.

ئەمە مرۆڤە -وەك فرۆید وێنەی کێشا- روت... روت لە هەمو ڕەوشـت و لـە هەمو ئاین و لە هەمو هەستێکی پــاك. هــەمو ئــەو پۆشــاکانەی شــەرمگە[2] بــەر هەست و دەرونی و گوزارەییەکانیان دادەپۆشت، هەموی پەردەیەکی ساختە بون کە نە نوێنەری حەقیقەت بون، نەبەهایــەکی شایســتەی بایــەخ پێــدان... بــەڵکو ئــەو پەردەیە خەفەکردن بــو، نــاڕەوا بــو. کۆســپی بــەردەم (گەشــەی سەربەســتی وزەی ســێکس) و کــۆت و پێوەنــد بــو... تاکــە حەقیقــەتی شــیاوی بایــەخیش، تــەنیا حەقیقەتێك، کە هەرشتێك لەو بترازێ ساختە و نــاڕەوان و شایســتەی لاچونــن... حەقیقەتی سێکسە، حەقیقەتی ئاژەڵی روت.

ئەمجارەیان شتێك رویدا بەوەی دەچو کە بەسەر داروین هــاتبو... لـە ســەرەتادا جەماوەر هەڵوێستی ڕکەبەری لە فرۆید وەرگرت و بەتوندی هێرشی کردە سەر... -تارادەیەك- لەپاڵ بیروباوەڕە ئاینیە (تەقلیدیەکەی) خۆی راوەســتا، کــە لــەواقیعدا تەواو تێیدا رۆنەچوبو و بیروباوەرێکی هۆشمەندانەش نەبو، هەروەك لــەریز ڕەوشــتە تەقلیدیەکەی خۆی راوەستا کە لەڕاستی بیروباوەڕێك نەبو خەڵکی بــە قەناعــەت و هۆشیاری بڕوایان پێهەبێ. بەتوندی لە پاڵ ئەو وێنە (مرۆڤانە)یە راوەســتا بــو کــە

١ پەلاش:هشیم.

٢ شەرمگە:عورة.

مرۆڤ ئاوا لە خۆی دەڕوانی و تا ئەوپەڕی شانازیشی پێوەدەکرد، فرۆیدیش هاتبو تا بریندار و پیسی بکا و پیسایەتی ئاژەڵی بەباڵادا ببڕێ.

بەڵام پاشان هەڵوێستی جەماوەر گۆڕا.

بەتایبەتی گەنجان ڕێکارەکانی[1] فرۆیدیان هەڵقوزتەوە و بەهەر چوار پەل خۆیان پێدا شۆڕکردەوە و بەرەو هەمو ئاڕاستەیەك جوغزەکەیان فراوان دەکرد.

ئەم ڕێکارانە فریاڕەسێك بون کە گەنجانی لە وشك و برینگی ئەو نەریتە ئاینیانەی پێشو باوبون ڕزگار دەکرد... ڕاستە کە ئەو نەریتانە بە تەواوی ڕەچاو نەدەکران، بەڵام ئەمە جێکەوتەکەی لە دەرونان کەمتر نەدەکردەوە.. چونکە لە حاڵەتێکی وادا -وەك فرۆید ڕاستی گوتوە- گرنگ نیە مرۆڤ ڕێکارەکانی دین لە هەڵسوکەوتی واقیعی خۆیدا جێبەجێ بکا یان نا، بەڵکو ڕادەی هەست کردنی بەو ڕێکارانە لە نەستیدا گرنگە، لە گەڵ ڕادەی ئەو فروسمانانەی پێی دەگەیەنێ ئایا ئەو کارەی بەتەمایە ئەنجامی بدا هەڵەیە یان ڕاست.

ئەو نەریتە ئاینیانەی پێشان لە ئەوروپا باوبون زۆر ڕەق و وشك و برینگ بون. سێکسی وەك پیسی و پۆخڵیەك دەبینی دروست نەبو دڵانی پاك وەخۆی گرن. لێدوان و نێزیك بونەوە و دەست لێدانی لە دورەوەش پێ حەرام و بۆ ئەو کەسی بیویستبا خۆی پاك و بەرز ڕاگری. پاشان لاوان -کەوا کێشە و گرفتی سێکسی لایەنێکی گەورەی هەست و بیری داگرتون- لە دەستور گەلی فرۆید پشیدان[2] و بەرەڵلاییان دۆزیەوە و پاڵپشتێکی بەهێزیان دەسکەوت هەتا لە بەرامبەر فشاری ئاین و ڕەوشت و نەریتەکان پشتیان بگرێ، پاڵپشتێك بو ئەو مۆری (تاوان)ەی لە

---

1 ڕێکارەکان: تعالیم.

2 پشیدان:هەناسەدان.

تەوێڵیان سڕیەوە كە پێشتر دیداری كۆمەڵیان پێدەكرد و لەناوەوەش دەرونی خۆیان روبەڕوی دەكردنەوە و بەلاچاوی دادەدانەوە، لە جیاتی ئەوە دروشمێكی سەرنج ڕاكێش و فریودەری پێبەخشین: دروشمی وێران[1] و ئازادی و رەهابون و روبەڕوبونەوە.

هەروەك جەماوەر، بە پیر و لاوانیەوە، دەرفەتێكی نوێیان دۆزیەوە بۆ روخاندنی پاشماوەی ئەو بنیادەی كە پێشتر بەرز و بالآبو كەچی ئەمڕو وا دەهەژێ و دەلەرێتەوە. ئەو بنیادەش (كلێسا)ی زاڵ و فەرماندار بو.. دەرفەتێك بۆ ئازاد بون لەو دێوەی پێشان گەفی[2] لێدەكردن، ئەو دێوە ئەرژەنگەی تا بریندارتر بێ و زامەكانی قوڵتر بن ئەوان لەناخی دەرونیانەوە شادیەكی سەرتاپاگیر دایاندەگرێ. جا با بانگەوازی مرۆڤایەتیش بەرێی شەیتاندا ئاو و ئاوچێ، ئەگەر تەنگە تاوكردن و كۆتی لە گەڵدابێ. دەبا (ئاژەڵێتی) دروشمی مرۆڤانە بێ مادام ڕاپسكان[3] لە كۆت و بەندانی لەگەڵ دابێ.

جا ئەمەش بەتێگەیشتنی واقیعیانەی (سروشتی مرۆڤایەتی) ناوەزەد كرا.

* * *

كاریگەری فرۆید تەنیا لە گۆڕەپانی تۆژینەوە دەرونیەكان و سەردانگە سایكۆلۆژیەكان نەبو، هەروەك پێشتریش كاریگەری داروین تەنیا لە بواری تۆژینەوەكانی ژیانناسی دا كورت هەڵنەهاتبو. لەواقیعدا هەردوكیان چێوەی (زانست و توێژینەوەیان) بەزاند بو و تێڕوانینێكی دیاریكراویان بۆ (مرۆڤ) هێنائارا، لەسەر بنچینەی ئاژەڵێتی و ماددی مرۆڤ.

---

١ وێران:جرأة.

٢ گەف:تهدید.

٣ راپسكان: التفلت.

هەروەك چۆن هزرەکانی داروین و تیۆری گەشەسەندن بەسەر ئـــاین و رەوشــت و نەریتەکان رەنگیان دایەوە، بەمشێوەیەش هزرە سێکسیەکانی فرۆید لە هەمان ئەو بازنانەدا رەنگیان دایەوە، بەڵکو ئەمانە کاریگەریان تێدا زیاتر بون و پتر لە کوچــە و کەلەبەرەکانیان رەگاژۆ بون و بلاوەیان کرد، چونکە راستەوخۆ لەگـــەڵ رەوشــت و نەریتــەکاندا وێــك دەکــەوتن، بــەڵکو هـــەوڵیان دەدا هـــەر لـــەرەگ و ریشــــەوە هەڵیانکێشیَ.

دوابەدوای فرۆید گەلێك رێچکە و رێرەوی هونەری و ئەدەبی بــە شــوندا هــاتن. رێرەو گەلێك تێکرا لە هەوڵی ئەوەدابون ســێکس وەك تــەوەر و رەگــەزی تاکانــەی ژیانی مرۆڤایەتی بخەنە رو، هــەروەك بــۆ ئــەوە تێدەکۆشــان کۆتــەکانی رەوشــت و نەریتان وەك بێناوەزی[1] وێنەبکێشن. کە نابێ مرۆڤایەتی مومارەسەیان بکات، یــا ریاکاریەکن هیچ یەکێك لە ناخی دەرونی خۆیەوە بروای پێیــان نیــە. ئــەوجا دەبــێ بەرەو واقیعێکی راشکاو وازیان لــێ بهێنین. راشکاوێتی ئاژەڵێکی روت.

هــەروەها چــیرۆك و شــانۆگەری و شــیعر و وێنــە و مۆســیقا و رۆژنامەگـــەری خزمەتکاری سێکس دەرکەوتن، کە بۆ دەرخستن و بەرجەستەکردن و تیشك خـــستنە سەر و پەردە لـــەرو لادان و لابردنــی شــەرم و دنــەدان بــۆ ئاشــکرا و بــەرۆژی رون مومارەسە کردنی سێکس، رەخسابون..

سێکسبازیش بەدەر لــەو ســنورە (شــەرعی)یانــەی ئاینــەکان بۆیــان کێشــابو، بەگوێرەی مرۆڤایــەتی کــارێکی تــازە نــەبو، بــەڵکو هــەر لەگــەڵ بونــی کۆمــەڵی مرۆڤایەتیدا هــەبوە. بــەلاّم ئــەوەی لــە دوای فرۆیــد تازەداهــات، ئــەو بانگــەوازە ئاشکرایە بو کە شەرمی نەدەکرد و ئەو ئاژەڵێتیە بو کە هیچ پەردەی نەبو. لەگــەڵ

---

١ بێناوەزی:سخف.

(شەرعیەت) دان بەوکارەی کە لەپێشــودا شــەرعی نــەبوو، هەرکەســێکی توخنــی کەوتبا لە پەناوە و دور لە چاوان ئەنجامی دەدا.

هەندێك ئەدیبی وەك (د.هـ.لۆرانس)یش بونە پسپۆری نوسین لەبابەت ســێکس و چێژبەخشین بە خوێنەران و ســەرنج راکێشــان و خافلاندنیــان بــە وردەکاریــەکانی و وەکارخستنی لێــهاتویی.هونــەری لەرادەبــەر بــۆ بانگــەواز بــۆ دۆزی (جەســتە) و دەرخستنی وێنەی ئاژەڵی ناو قەوارەی مرۆڤ بەشێوەیەك کــە هــەر ئــەو بەڕاســتی مرۆڤە، هەر ئەو ئاژەڵێتیە بەتەنێ و هەرچی لەو بترازێ هەمو پوچ و نارەوان.

ئەمە ئەدەبە جدیەکە.. هەرچی ئەدەبی (سێکسی) پەتیشە، ئەو ئەدەبەی هەمو خەمی هەر ئەوەبو باسی ساتەکانی سەرجێیی بکا و لەسەری بڕوا و دوپاتی کاتەوە و لەسەری بڕوا و دوپاتی کاتەوە... لــە سەرانســەری دنیایــێ و بەشــێوەیەکی بــێ وێنەی تونــد و فــرە ئــەم شــێوازەی ئــەدەب پــەخش و بڵاوبــوەوە، دیــارە گەشــەی چاپەمەنی و توانستی ڕو لە زیاد بونی، ئاریکاری ئەم جۆرە پەخش بونەبون.

ڕۆژنامەوانیەکی تەواویش بە بانگەواز بۆ کاروباری سێکسی و نقێمدار کــردن و رازاندنەوەی و لێکۆڵینەوەی لایەنە جوداکانی تایبەتمەندبو. جارێك لــە روی دیــن و تێك گیربونی رەزاگرانی لە گەل (واقیع) ی مرۆڤ و جارێکی لــە روی ئــەو نەریتــە بێتامانەی کە بەربەستە لەرێی(گەشەی سەربەستی وزەی سێکس). جــارێك لــەڕوی ڕەوشتەکان و خۆتێهەڵقوتاندنیان لەو شتانەی مافیان نیە تێکەڵی بــن وەك ئــازادی هەست و کردار. جارێك لە روی سەربردە و چیرۆکی سێکسی ئارەزو بزوێن. جــارێك لە روی وێنەی روت و جارێك لــە لایــەنی نوکتــەی سێکســی و جــارێك لــە لایــەن رانواندنی کێشە و گیروگرفتە عاتیفی و کۆمەڵایەتیەکان و لەهەمو لایەن و رویــەك بەشێوەیەك هەر کەسی بیەوێ ئەو (پۆشاك)ە هەستی و واتاییە لەخۆی دابماڵی کــە

مرۆڤ شەرمگەكانی پێ دەشارێتەوە بتوانێ خۆتێكوتێ و بەرۆژی روناك خۆی روت دەرخا.

مۆسیقایەكیش بەتەواوی بۆ وروژاندنی سێكس و گـوزارە لێكردنـی تایبەتمـەند بو. گەلێك جۆران دەربڕین و گوزارەكردن، بە تەنیا یا لە پاڵ گۆرانی و سەما كردن. جا بە هەرا و هۆریا دەریدەبڕی وەكو ئاوازەكانی جاز، یا بەهەڵپەڕینێكی چالاكانـە وەك هەندێك ئاوازی سەما، یا شەپۆڵدانێكی هەستیاری دیار وەك هـەندێ جـۆر و بابەتی تر.

ئەمانە هەموشی لە شانۆ (چاكە)كان و یانە (پاك)ەكان، هەرچی شانۆ سێكسیە پەتیەكان و یانە ئاژەڵانە روتەكانیش بون جۆرەها گۆرانی و سـەما و موسـیقای وا ناخوازێ باسیان بكرێ.

هونەر گەلێكیش بە (دیراسە)ی جەستە تایبەتمەند بون... نەك بە شێوازی كۆنی یۆنانی كەوا لە گەڵ خاو و خلیچكی و پوچپەرستی لە (جەستە)دا بە دوای جوانیدا دەگەڕا، بەڵكو بەرێچكەی (فرۆید).. ئەو رێبازەی لە جەستە سێكس رادەنوێنـی و هەر بە روت و قوتی بۆ چاوانی دەردەخا، چونكە ئەمە لە مرۆڤدا حەقیقەتە.

سەرەڕای ئەوانەش هەموو، سینەما هات.. بوە گورزێكی پشت شكێن.

سینەما هەر لە سەرەتای دەركەوتنەوە هونەری (جەماوەر) بو، ئەو جەماوەرەی ئەدەب ناخوێنێتەوە و پارەی شانۆی دەسـناكەوێ و بـواری سـەمای بـۆ نارەخسـێ لەگەڵ ئاهەنگی گۆرانی و موسیقادا، دەرفەتی نیە بەسـەر وێنـەكان بسـوڕێتەوە و چاوبداتە (كەڤاڵ)ەكان[1] ئەو جەماوەرە لە سینەما دەگا و سەرشێتانە بـەرەو روی دەچێ.

---

[1] كەڤاڵ: لوحة.

لەدایکبونی زانستیی سینەما و فیلم لە سەردەمی (فرۆید)دا بو. بۆیە کاتێك لە دایك بو تەواو بەسێکس و پیس ببو. لەگەڵ هەندێش -وەك هەمو شتێك- پلە پلە لە کۆمەڵێك فیلمەوە دەستی پێکرد کە بیرۆکەیەك و کەمێك سێکسی هەڵگرتبو، تا گەیشتە ئەو فیلمانەی زۆربەیان سێکسیان هەڵگرتبو لەگەڵ کەمێك بیرۆکەدا، هەتا وەکو ئەو فیلمانەی بێ لە سێکیس چیدەیکەیان تێدا نەبو وەك فیلمەکانی خۆپیشاندان.

سینەما بە توانستە هونەریە گەورەکانیەوە ئەزمونی جەماوەر بو. چونکە لە واقیعدا کۆمەڵە هونەرێکی پێکەوە کۆك و پێکرا رێکردوە.. هونەری چیرۆك و هونەری شانۆ و هونەری وێنەگرتن و هونەری مۆسیقا و هونەری گۆرانی، هەمو پێکەوە کۆبونەتەوە، لەپاڵ ئەو توانستە زانستیانەی وادەکەن ئەو تێپە دەنگدار و وێنەدارە -بەم دواییەش بەرجەستەیە- لە هەمو شتێك زیاتر لە روکەشدا بە واقیعی ژیان بچێ.

لەپاشاندا کاریگەری سینەما لە نەمانی رەوشت و نەریتەکان لەهەمو ئەوانەی پێشەخۆی لە رۆژنامەوانی و رادیۆ و هونەرەکانی دیکە بەهێزتر بو.. چونکە (واقیعی) سێکسی بە بەرجەستەیی هەڵگرتبو و بەشیۆەیەکی زۆر سەرنج راکێش و پەتاتاسا و کاریگەر پیشانی دەدا.

جا ئەگەر سینەمای سێکسی چوەپاڵ شانۆی سێکسی و مۆسیقای سێکسی و رۆژنامەوانی روت و هزر و بیری روت و بانگەوازی ئاشکرا بۆ رماندنی ئاین و رەوشت و نەریتان[1] بەم شێوەیە نەوەی وا هاتنەکایەوە کە لە ناخی خۆیاندا بێجگە لە حەقیقەی سێکس دان بە هیچ حەقیقەتێك دانەنێن و لەلایان زۆر ئاسایی

١ ئاشکرایە ئەو سەردەمەی ئەم کتێبەی تێدا نووسراوە، هێشتا تۆڕی ئینتەرنێت دانەهاتبوو، دەنا بێگومان رۆڵی ئەو داهێنانەشی لەمڕوەوە دەخستە رو. -ژیوان-

بێ ئەگەر ئەو تاژەڵەی لە مرۆڤدا خۆی حەشارداوە روت و قوت بێتەوە، روتبونەوەیەکی هەستی و مەعنەوی، روتبونەوە لە هەستکردن و لە رەفتاردا، روتبونەوە لە نێو ماڵ و لە سەر شەقام، روتبونەوە لە قسە و لە جوڵانەوە و لەرۆیشتن و دانیشتن و سەیر کردن.. حەیوانێکی روتوقوت.

* * *

جا دەمێك پێش ئەو کاتە، لەو کاتە و پاش هەنگی، شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا کاری خۆی لە روخاندنی رەوشت و نەریتەکان ئەنجام دەدا.

شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرا -وەك مێژو- بەماوەی نێوان ١٧٦٠-١٨٣٠ سنوردار دەکرێ، بەڵام ئەمە تەنیا دیاریکردنێکی (زاراوەیی)ە لە گۆڕانی ئامرازی دەستی بە ئامرازی هەڵمی. هەرچی ئەو بزاڤە کۆمەڵایەتی و بزاڤە دەرونیەش بو کە شۆڕشی پیشەسازی هێنایە کایەوە دیارە کە لە ساڵی ١٨٣٠دا نەوەستان، بەڵکو واشیاوترە بڵێین کە ئەوکاتە دەستیان بە قایم بونی کرد!

لە وڵاتانی دیکەی ئەوروپاش درەنگتر شۆڕشی پیشەسازی دەستی پێکرد و شەپۆلە یەك لە دوای یەکەکانی ئەو شۆڕشە وڵات لە دوای وڵاتیان دادەگرت. لە رواڵەت و روکەشدا پێك دەچون، بۆیە خەڵك وایان بە خەیاڵ دادەهات ئەوە دیاردەیەکی گشتیە و پێکرا کەوتۆتەڕێ و لەگەڵ یەکدا کۆکە، بۆیەش باوەڕیان بە لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژو هێنا[1]!

ئەوروپا لە چاخەکانی ناوەڕاستدا لە سایەی دەرەبەگایەتیدا دەژیا. ئەو دەرەبەگایەتیەش لەگەڵ ئەو تاریکیەی ئەوروپای لە چاخە تاریکەکاندا تێیدا نقوم بوبو، پێکەوە سێبەریان لە ئەوروپا کردبو، هەتاکو لە چاخی رێنیسانس و بزاڤی

---

١ التفسير المادي للتأريخ.

راپەڕین و ژیانەوە وەئاگا هاتەوە..

درەرەبەگایەتیش دەستی بە خاپوربون کرد کاتێك شۆڕشی جوتیێرە کۆیلەکان سەریهەڵدا و دەستیان بە هەڵاتن کرد لەو زەویەی پێیەوە کۆت و بەند کرابون و مافیان نەبو لێی جودا ببنەوە و تیایدا ئازادیان نەبو و یەك سیمای ئادەمیانەی باڵا یا تەنانەت نزمیشیان نەبو، بەڵکو کۆیلە و ئاژەڵان وەك یەك بون. یاخود رەنگە ئاژەڵ رێزی لێ گیرابا -تاکو بژی و کاربکا- کەچی کۆیلە ئەو رێزەشیان نەبو!

بەڵام روکاری ژیان لە ئەوروپا بەشێوەیەکی کاریگەر نەگۆڕا هەتاکو ئەو کاتەی بەرەو پیشەسازی چو.

پێشتر مولکدارەکان -بەرامبەر شۆڕشی جوتیاران- ناچاربون لە کۆیلایەتی رەهایان کەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جوتیارانە هەر لە زەویەکاندا مانەوە و کاریان دەکرد و ژیانیان گۆڕانێکی وەهای بەسەردا نەهات.. چونکە ئەوان -لەواقیعدا- تەنیا گۆڕانکاریەکی کەمیان لە خۆیاندا ئەنجامدابو، هەر -رواڵەتی- کۆیلایەتی گۆڕابو حەقیقەتەکەشی لە ناخی دەرونان‌دا مابۆوە.

بەڵام کە پیشەسازی دامەزرا، رەوشەکە لە بنچینەڕا گۆڕا.. هەر هیچ نەبێ لە روکەشی کاروبارەکاندا [1]! پیشەسازی لە شاردا دامەزرا و پێویستی بەکارگەران بو.. هەر لە بنەڕەتیشدا شار هێندەی تێدا نەبو کە پێویستی پیشەسازی تازە پێگەیشتو تێرکا، بۆیە هەر دەبوا چەندی پێویستە لە لادێوە بهێنێ.

جا ئەو لادێیيە هات کە لە خاکەکەی هەڵکێشرابو و لە پەتکی دەرەبەگان دەرکێشرابو. هات هەتا بێباك لە قامچی (خاوەنەکەی)، بێباك لە کۆتەکانی پاشکۆیەتی و رەنجکێشانی بێبەروبوم و ماندوبونی بێداهات پێ بنێتە شار.

-هەر بەلای کەمی بۆ تاوێك- هەست بە تامی سەربەست بون و شیرینی ئازادی

بکا[1]!

جا جوایەزیەکی گردەبڕ لە نێوان جیهانی لادێ و جیهانی شار لە هەستی ویدا دروست بو.

جیهانی لادێ ریسیوایی وپاشکۆیەتی و کۆیلایەتیە، جیهانی شاریش ئازادبونە لە کۆتەکان.

رێکخەرێکی- لۆژیکی- لەدەرونی کارگەران نەبو پێیان بڵێ: لە ژیانی لادێ (واتا)ی جوان هەن چاکترە لە گەڵ خۆیان ببەن، یان (بیروباوەڕ)ی بەرز کە لە شار بۆیان دەگونجێ، یان (پەیوەندی مرۆڤانە) کە باش نیە لەگەڵ جێهێشتنی گوند جێیان بێڵن، یا لەگەڵ پشتگوێ خستنی کۆیلایەتی و نەبونیی زەبونکەر پشت گوێیان خەن.

نەخێر! ئەو رێکخەرە (لۆژیکی)یەیان لە دەروندا نەبو شتی گونجاو یان بۆ لە هی نەگونجاو هاوێرکا[1]، بەڵکو بزاوتێکی ویژدانی هەڵچوبو ئازادی و رەهابونی دەخواست. هەر خەمی ئەوەی لەبەر بو هەرچی هەیە بیخاتە پشت سەری خۆی و هەمو شتێك وردوخاش کا.. هەتا هەست بە هاتنە بونی ژیانێکی تازەبکا.

تۆ واش دانێ حوکمی خۆی بردە بەر لۆژیك و تەرازوی گرتە دەست..، ئایا هیچ شتێکی لە چاکە و حەق لە دەست مابو کە پارێزگاری و داکۆکی لێ بکا. لە کاتێکدا بە خۆی لە مالاتان[2] زەبونتر و لە ئاژەڵان ریسواتر بو؟

نەخێر! با گوند بچێتە دۆزەخ.. با کارگەران لە شاری ئازاد دا بژین، بەرەڵا لە هەمو کۆتێك.. هەمو کۆتێك!

---

١ هاوێرکا: جیاکاتەوە.

٢ مالات:حەیوان.

ئەمە یەکێك.. یا ئەوە بنچینەکە.

جا کارگەران تاکتاك هاتن.. لە گوندی جودا جواداوە تەنانەت ئەگەر لە گوندێکیش بان هەر پەرتەوازە بون و تاکو ئێستا یەك ماڵ و یەك نشینگە پێکی نەدەبەستانەوە و هیچ فاکتەرێکی هاوبەشیان لە نێواندا نەبو..

لە لادێ یەکتریان دەناسی وبەڕاستی نێزیکی یەك بون، کە نێزیکاتی خوێن و خزمایەتی.. یا بەلای کەمی نێزیکاتی ناسیاری و هاوسێیەتی بو.

بەڵام لە شاردا پەرتەوازە بون. نە خزم بون و نە ناسیار.

هەر تاکێك لەوان وای هەست دەکرد پەیوەندیەکانی پێشتری هەمو لە ناکاودا پچڕان. ئەو نەریتانەی لە گوندیش ملکەچیان بو و دەستی پێیانەوە دەگرت -زۆر جاران لە شەرمی خەڵکی، نەك لەبەر باوەڕپێبون- ئەم نەریتانە هیچ بیانوی مانەوەیان نەبو.. دەبێ لێرە کێ بیناسێ؟ یا گرنگی پێبدا؟ یاخود ئەگەر لەگەڵ نەریتان ناکۆك بو لێی بپێچێتەوە؟

بابەرەڵابێ.. لێرە لێپێچانەوە نیە!

ئەمەش یەکێك..

کارگەران -لەسەرەتادا- بەتەنێ هاتن، بێ خانەوادە و بێ خێزان.

باری گوزەران لە شاری هێشتا تەواو دابین نەبو تا کارگەر خێزانی بباو بۆ شار رایانگوێزێتەوە. ئەمە ئەزمونێکی نوێ بو و بەترکزان دەورەدرابو، یا تێدەچو یادەردەچو. بۆیە ئاوا شیاوتر بو کارگەر بە تەنیا سەفەرکا. کە کاروباری دامەزرا خاوخێزانی بچنە لای.

بەتەنێ بون -زۆران جاریش- لە تەمەنی گەنجێتی بون. لەسەرەتا ئەوەی خورت و بەهێز نەبا، بەرگری کاری نێو کارگەکانی نەدەگرت. چاپوك و بەتواناش نەبا

خوەنكار وەريان نەدەگرت.

بەتەنێ بو -لەتەمەنی گەنجێتیدا- بەربەستی لەبەردەم نەبو، چونکـە رەوشـت و ئاین و (ویژدان) و نەریتەکانی لەو رۆژەوە واز لێهێنا، کە لە گوندەکەی راپســکا و ړوی لە شار کرد، لە شاریش ئەو پێشگرەی لەپێش نەبو کە لە لادێ رێی دەگـرت و ـوی شەرمکردن بو لە کەسانی دیکە، موغرەیاتیش لە دەورەی بون.

داوێنپیسی و لە شفرۆشی -هەر لە زو را- لە شـار هـەبوە. ناوەنـاوە لـە ژێـر پەردە و ناوەناوەش بە ئاشکرا، بەڵام بەردەوام هەر هەبوە.

ئەو گەنجانە ملیان لێنا -لەماوەی قەتیس مانی سێکس دور لە خێزان- خۆیـان ـە زیلدانی ئارەزوبازی نقوم دەکرد.

لەسەرەتادا کارگەران هەستیان دەکرد زەرورەتە.. بەڵام پاشان بوە عادەت.

لە پاشانیش کە لە ژیانیان ئارخەیان و دڵنیـابون، ناردیانـە دوای خێزانـەکانیان هەتا بۆ شار بێنە لایان، یـان خـێزانی تازەیـان لـە وڵاتـی نوێـدا پێکوەنـا. ئـەوە ړەرورەتی پێشوی لە ناونەبرد، بەڵکو بۆ ئـەوە نوێیـەکان بـەجێما، کـە دەرفـەت و ړێچکەیەکی سانایان تێدا دیتەوە خۆیان پێدا لـە فشـاری سـێکس رزگـار کـەن و هیـچیشی بە دوا دا نەیەت.

داوێن پیسی، بە شێوازی جۆرا و جۆری، هـــەر لـە یەکـەم (هاورێیـەتی) تاکـە کەسی تا دەگاتە لەشفرۆشتن بە هەر کەسێکی حەزی لێبێ.. ئەمە بوە نەریتگــەلی تازە لە شار.. نەریتگەلێك چاودێری بۆ تەرخان دەکرێ و یاسا پارێزگاری دەکا.

ئەمەش بەو پێشکەوتنە ناونرا کە لە گەڵ واقیع رێدەکا و لە ئەندێشە و خەیاڵدا ـژی.

* * *

کاریگەری شۆڕشی پیشەسازی لە هەڵوشاندنەوەی پەیوەندیـــەکان و پـەرەکردنی ڕەوشتدا هەر لەو سنورە نەوەستا..

کارگەران -کە لە پێشودا بــە هاتنیـان بـۆ شـار خـەنی ببـون- دژ بـە خـاوەن کارگەکان دەستیان بە سەربزێوی کرد کە بە شێوازێکی زۆر دزێو دەیانچەوساندنەوە و دەسەعات یا دوازدە سەعات یا هەندێ جار چاردەسەعات بەرامبەر بە کرێیەکی کەم دەیانخستنە بەرکار کە بەشی ژیـانێکی سـەربەرزانەی نـەدەکرد و پێداویسـتی کارگەری دابین نەدەکرد.

لەوکاتە خـاوەن کارگـەکان بـە فرتـو فێـل لـە کارگـەران ژنانیـان بـۆ هـەمان سەعاتەکانی کارو بەکرێی کەمتر خستەکار

وەکارخستنی ژنان دو کارەساتی مەزنی لە ژیانی ئەوروپادا بەرپاکرد

یەکەمیان: پێوەندی خێزانی هەڵوەشاندەوە کە پێشتر ئافرەت چ ژن بێ چ دایك، دەستی پێوە گرتبوو، بون و ژنێتی و زیندەگی و سۆزی خۆی بەسـەردا هەڵرشـتبو. کە سەرەداوەکانی کۆدەکردەوەو سـیفەتی قەوارەیـەکی زنـدوی پێـدەدا . ئـافرەتی کارگەر -لەو باروزروفە کرێتـەی کـە هـەمو کـاتێکی زینـدو و هـەمو تونایـەکی زیندوی دەگرتەوە- نـەیدەتوانی هیـچ چاودێریـەك بـە ماڵـەوەی خـۆی ببەخشـێ، هەرچەند ئەگەر ویستی لێبا و سۆزیشی بوبزوابا.

دوەمیش : لەبەر زۆران فاکتەر ڕەوشتی ژنانی گەندەڵ کرد.

سیستەمی ئەوروپا پێشتر بایەخی بەژن نەدەداو هیچ مافێکی (شارسـتانی) یـا ئابوری پێ نەدەدا.

مافی نەبو موڵکی هەبێ. نەدەبو بخوێنێ و فێربێ .مافی نەبو هیچ جۆرە رایـەك دەربڕێ، یـا لـەکارێکدا بـەژداربێ. پشـتگوێخراوێك بـو ببـوە پاشـکۆی پیـاوان.

پاشکۆیەتیەك لە ئاتاجی بۆ خـوراك و پۆشـاك و خـانو و سـێکس دروسـت بویـو. پاشکۆیەتی نەك هاوبەشی. پاشکۆیەتیەك هیچ هەستێکی مرۆڤانەی لەخۆ نەگرتبو و هیچ بایەخێکی بە قەوارەی ئادەمیزادان نەدەدا جا لەسایەی ئەو پاشکۆیەتیەدا ئافرەت پابەندی ئەو (فەزیلەتانە)بو کە کۆمەڵ واتە -پیاو- بەسـەریدا سـەپاندبو. ئەو پابەند بونەش زۆر جاران لە بیروباوەڕ پێبونێکی زینـدوی هۆشمەندانـەوە نـەبو، بەڵکو نەریت و چاولێکەری بو.

کە ژن هاتە مەیدانی کار و سەودا و قازانج کردن، هەسـتی کـرد بەربەستەکە روخا، ئەمرۆ چ قەرداری پیاوە؟

پیاو بەچی دەیکاتە کۆیلە؟

بەپێداویستی بۆ پارە؟ وا بەخۆی ماڵداری دەکا و نانی خۆی وەدەست دێنـێ و، لە پاشکۆیەتی رزگار دەبێ.

بە پێداویستی بۆ سێکس؟ بەڵێ... بـەڵام ئەمەشـیان خـۆی دەسـتی دەخـا، هەرکەسێکی حەزی لێبێ و هەڵیبژێرێ خۆی دەداتە دەست.

جا هەست کردن بە ئازادبونی ئابوری و (ئازادبونی) سێکسی هەستی بـەرەڵابون لە کۆتگەلی ئاین و رەوشت و نەریتانیشی لەگەڵدابو، -لە گەرمەی چێـژی یەکـەم ئازاد بون- هەستی کرد کە بەرەڵابونی سێکسیش سەرکەوتنێکی نوێ بو.

ئەمەش بەو(پێشکەوتن)ە ناوزەد کرا کە ژنی لە کۆتان ئازاد کرد.

* * *

شۆڕشی پیشەسازی بەڕێوەبو و هەرچی دەهاتە سەرەڕێی تێکی دەشکاند..

ئەو باروزروفەی کە پێشتر وەسـفمان کـرد، بـە تـەنیا کاریگـەریان لـە بنیـاتی کۆمەڵگە و رودانی ئەو گۆڕانکاریە گەورەیەدا نەبو.

بەڵکو ئەو زۆر و ستەمانەی لە کارگەران دەکران گەلێك پێشـڤەچونی سیاسـیان هێنا ئارا. هەروەها پەیدابونی چینێکـی ناوەڕاسـت لـە فەرمانبـەری کارگـەکان و حکومەت کە لە شاردا دەژیان و هەستیان بە سـتەمەکان دەکـرد و بـۆ دەسـەڵات دەبزاوتن.

هەر تایەفەیە و چینێك -بەحوکمی رەوش و باروزروفی خۆی- لـە کۆتوپێوەنـدان هەراسان و جاڕس بون و حەزیان لە کاولکردن بو.

دەیویست ئەو دەسەڵاتە کاول و وێران بکا کە بەسەریدا سەپا بـو، جـا لەلایـەن دەوڵەت بوایە یا خاوەن کارگە و سەرمایەداران.

دەیوست مافگەلی دیکەی دەسکەوێت. ئازادبون بەدوای ئازادبون و قەوارەیەکی نوێی دەسکەوێ.

وای هەستدەکرد هەمو ئەرکەکانی کاری لەسەر شانە، بەبێ ئـەوەی مـافی لـە بەرامبەریاندا هەبێ. هیچ یەکێك لەو تایەفانە نەبو کورسی حوکمی لەدەسـتدا بـێ کە تایبەتبون بە بەگزادە و سەرمایەدارە میراتگرەکانیـان. هیـچ دەنگێکیشـی لـە پەرلەمانەدا نەبو کە یاسای دادەنا، تەنانەت لە زۆر کاتانیش مافی دەنگدانیشـیان نەبو. هەروەك مافی پێکهێنانی سەندیکا و کاری نەقابیشیان نـەبو کـە گوزارشـی پێ لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بکەن و، هێزیان تێـدا یـەکانگیر کـەن بـەروی ئـەو چینانەی کە لە سەروی ئەوانەوە بون.-لە هەمو بارێکیشـدا- ئـازادی کۆبونـەوە و ئازادی وتاردان و ئازادی رادەربڕین و ئازادی مانگرتنیشیان بۆ دەستەبەر نـەدەکرا. هـەروەها کـاتێك دەسـەڵاتە کارگێڕیـەکان بـە شـوێنیاندا دەچـون زەمانـاتی تۆمـەتبارکردن و زەمانـاتی لێکۆڵینـەوە و زەمانـاتی دادگـاییکردن و زەمانـاتی جێبەجێکردنی بۆ دەستەبەر نەدەکرا..

بۆیە کێشە و ململانێکەیان بۆ وەدەست هێنانی ئەو مافانە زۆر توند بو.

جا لە نێو ئەو ململانێ خوێناویە-یا نیمچە خوێناویە- ئەو ڕێکخەرە لۆژیکیە نەبو بڵێ: من لە ستەم ئازاد دەبم. لە دەسەڵاتی بێ‌سنوری گەورە یا دەوڵەت ئازاد دەبم، بەڵام لەو کۆتانەدا دەمێنمەوە کە بە مرۆڤایەتیەوە پابەندن، ئەو کۆتانەی گەر مرۆڤ لێیان داماڵرا دەبتە ئاژەڵ. لەسەر بیروباوەڕ دەمێنمەوە. لەسەر ڕەوشت دەمێنمەوە. چونکە ئەمانە پاژێك نین لە ململانێ لەگەڵ دەوڵەت و لەگەڵ خاوەن کارگە و سەرمایەدارەکان. من شۆڕش بەسەر ستەم دەکەم نەك بەسەر مرۆڤایەتی.

نەخێر! ئەم ڕێکخەرە لۆژیکیە لە جوغزی ئەو ململانێیە دا نەبو کە بۆ پارەو نان و لەسەر بەهای زەمینی روتدا بەرپابو، هیچ پەیوەندی بە ئاکار و ڕەوشتەکانەوە نەبو.

لەوەش گرنگتر-لەو بۆچون و دیدەی ئێمە وا لەم بەندەدا پێیەوە خەریکین- تەوەری ئەم ململانێ و زۆرانێیەی کە بەرەو ئازادبونی دەڕوانی و، تەوەری هەمو فەلسەفەی سەرمایەداری ئەو سەردەمی بریتی بو لە (ئازاد بونی تاك) لە ژێردەستەیی لەگەڵ مافی ئەوەی هەر شتێکی کە بیەوێ بەبێ شەرمەزاری بیکا.

سەرمایەدارەکان داوای مافی وەگەڕخستنی سەرمایەکانی خۆیان دەکرد لەو شتانەی کە-خۆیان- چاك و ڕاست دەهاتە بەرچاویان. وتەیەکی ناوداریشیان هەبوو دەیگوت: (Laissez Faire) لێی گەڕی با کار بکا، یان لێی گەڕێ-چی پێ‌باشە- بیکا، ئەمەش گوزارشی لە هەمو ڕەوتەکەیان دەکرد. گەلیش داوای مافی ئەوەی دەکرد بە کەیف خۆی چۆنی بوێ وا هەڵسوکەوت کا و، مافی ئەوەی چ بۆچون و رایەك بەچاك بزانی بەو پابەند بێ و ڕێگایەکیش بەویستی خۆی بگرێتە بەر بۆ دەربڕینی ئەو رایە، بێئەوەی کەس مافی هەبێ بیکشێنتەوە یا ڕێی ویستەکانی لێ بگرێ. لە پاشانا هزرمەندەکان-وەکو یەك لە داواکانیان-

بانگەوازی ئازادی ئیلحادیان هەڵدا، لەگەڵ ئازادبون لە بێڕەوشتی و، ئـازادبون لـە وێرانکردنی نەریتان.

ئازادبونی سیاسیش کەوتە ڕێ. کە ئازاد بون لە هەمو کۆت و پێوەندێکی لەپاڵ دا بو. لە هەمان کاتدا دۆعای (داروین) و (فرۆید) فویـان پێـدا دەکـرد، لەگـەڵ لێکدانەوەی کەرەسەتەیی بۆ مێژو.

ئەمەش بە لەدایکبونێکی نوێی ژیاریی ئەوروپا ناونرا.

* * *

کاروبار هەروا مایەوە تا لە ساڵی ١٩١٤ یەکەم جـەنگی جیـهانی هەڵگیرسـا. شەڕ هەژانێکی یەکجار توند بو هەمو جیهانی توشی سەرسوڕان کرد و، بوە هـۆی ڕودانی کۆمەڵێك هەڵبەز و دابەز، زۆر بەها و زۆر چەمکی گۆڕی.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسەی چاو بەو ماوەیە و، بەپێش و، بەپاشـیدا دەگـێڕێ، دەبینی شەڕ لە کۆکردنەوەی هێزگەلە پێشکەوتوەکان و ڕسکاندنیان بترازێ هیچـی دیکـەی ئـەنجام نـەدا-بەشـێوەیەك ئـەو کەسـەی لـەناکاوڕا تێـی دەڕوانـێ وەك هێزگەلێکی نوێ دێنە بەرچاو کە پێشتر لە گۆڕەپاندا نەبون.

دزێوترین و خەتەرناکترین دەرەنجامی شەڕیش کوژرانی زیاتر لە دە ملیۆن گەنجی ئەوروپا و ئەمریکا بو لە گۆڕەپانی جەنگدا، بێجگە لەو پیـاو و ژن و منداڵانـەی، هێرشە ئاسمانیەکان لە ناو شاران کوشتیانن.

ئەمەش کۆمەڵێك دەرەنجامی ترسناکی لێکەوتەوە..

ئەوەبو ملیۆنان خێزان لە پاش جەنگدا کەسیان نەما بەخێویان کـا.. جـا ئایـا پیاوی ماڵێیان لەکاتنی شەڕدا کوژرابو، یا ئەوەندە سەخت بریندار ببو تێکشـێوابو و توانای کارکردنی نەمابو، یا بـە کـاری ژیـانی بـەردەوام لـە حەشـارگە و کـارە

ژەهراویەکان و، هێرشە کاولکارەکان و تەمای هەمیشەیی مردن شێت ببو و عەقڵی لەدەست دابو.

ئەمە لەلایەك..

لەلایەکی دیکەوە ئەو گەنجانەی دەرباز بون و توانای کارکردنیان هەبو، هەمو ئامادەنەبون ژن بێنن و خێزان بەخێو بکەن. ئەو بەشبڕاویە بێئامانەی چوار ساڵی تەواوی جەنگ تێیدا ژیان، بواری ماندوبون و زەحمەتکێشانی بۆ کەسانی دی لە دەروندا نەهێشتبون. هێند چاوبرسی لە شەڕێدا هاتبونە دەر دەیانویست لە ژیان بەرخودار بن. ژن و مەی و خۆشی و رابواردنیان دەویست، دەیانویست حەسرەت و حەزی گڕاوی دامرکێنن. بۆیە ئەو ژنەی کە دۆستی بێ و بەپیر ئارەزوی گەرمەوە بچێ، یا ئەو جەستەی بە پارە و پول بکڕدرێ، عەیبی نیە. بەڵام گەر بوە خێزان و دایکی منداڵ کۆت و بەند و ماندوبونی تیا رەنگداوە و قیڕەو جیڕەی بەدوادا هات، قەت بەخێرنێ.

لەلایەنی دوەمیش ئەو کاولکاریە گەورەیەی کە بەهۆی شەڕەوە رویدا، وزەیەکی بەرهەمێهێنانی زۆر مەزنی دەویست تا قەرەبو بکرێتەوە. ئەو هێندە پیاوەش کە مابون بەشی ئەو بزوتنەوەیان نەدەکرد کە بۆ بنیاتنانەوە و ئاواکردنەوەی سەرتاپاگیری هەمو شوێنێك پێویست بو.

ئەوەبو هەردو مەسەلەکە لەسەر یەك شت کۆبونەوە کە ئەوەبو: پێویستە ژنیش کار بکا. لە بازاڕ و لە کارگە و لە نێو کانەکان، دەبێ لە هەمو شوێنێکدا کار بکا.. ئەگەر نا بەخۆی و ئەوانەی بەخێویان دەکا لەبرسان دەمرن.

بۆیە ئافرەت ناچار بو-رازی بێ یا نارازی- ژیانی نیمچە ئۆقرەگرتوی ماڵ جێبیلێ و، دابەزێتە ئەو شەرگە پڕ هەرا و زەنایەی کە نە بەزەیی بەکەسدا دێتەوە و نە کەسێکیش پەنا دەدا.

هەروەها ناچار بو-رازی بێ یا ناڕازی- ئەگەر بیەوێ بژی دەسبەرداری رەوشتی خۆی بێ.

-لەو کارو پیشانە بترازێ کە هەر بە سروشت ژنانەن وەك مامۆستایەتی و پەرستیاری و مامانی- ژنان لەگەڵ پیاوانێك پێکدەگەیشتن کە ماکی جەنگیان پێوەبو.. ماکی ئارەزوی رابواردنی ئاسان و نێزیك. جا ئەگەر خۆی نەکاتە دەسەنە و بیەوی رەوشتی خۆی بپارێزێ، ئەوا هەمو دەرگاکانی بەڕودا دادەخرێن و هەمو کارێك ئەستەم دەبێ. خۆ ئەگەر رازی بێ و خۆ بداتە دەست هەمو دەروازەکانی لەپێش ئاوەڵان و هەمو شتێك ئاسان دەبێ..

بەڵام هەمو دەمێك و لە هەمو بارێکدا مەسەلەکە بەمشێوەیە نەبو، هەمو کاتێك زۆر لە ئافرەت نەدەکرا تا دەسبەرداری رەوشتی بێ بۆ ئەوەی کارێکی دەسکەوێ. بەڵکو ئەو هەر بەخۆی فاکتەرێکی دی هەبو دنەی دەدا.

نە بە تەنیا برسێتی خۆراك بو روبەڕوی دەبۆوە نە برسێتی جوانکاری و نەهی پۆشاك.

بەڵکو روبەڕی برسێتی دژواری سێکسیش دەبۆوە.

ئەو دە ملیۆنەی لە گەنجان کوژران شپرزەیی و لاسەنگیەکی ناهەمواری لەرێژەی ژنان بۆ پیاوان هێنایە ئارا، چونکە لە بەرامبەر ئەو ژمارەیەدا ملیۆنان کچ مێردیان دەسنەدەکەوت، ئەگەرچی هەمو پیاوانی زندوش ژنیان بهێنابا، چونکە لە ژمارەدا بەرانبەر نەبون. سیستەمێکیش نەبو رێ بە پیاوان بدا بە شێوەیەکی شەرعی زیاتر لە ژنێك بهێنن. هەرچەند هەمان ئەو سیستەمە رێی دەدا پیاوان بە شێوەی ناشەرعی لەگەڵ زیاتر لە ژنێکدا دەست تێکەڵکەن، بەو مەرجەی ئەو ژنە تەمەنی یاسایی بێ و زۆری لێنەکرابێ.

ئەوجا بەچ شێوەیەك هەر كیژە و پێداویستی سێكسی سروشتیانەی شەرعی پاكی خۆی دەسكەوێ؟

ئەگەر ئەو كیژۆڵەیە پاكیزە(قدیسة) یا فریشتە نەبێ دەبێ چ بكا؟ بێجگە لەوەی لە پەیوەندیەكی ناشەرعی-ئەگەرچی یاساییشە- بەشە سێكسی خۆی دەسكەوێ، یا لە تاریكی رایرفێنێ و بیقەپێنێ؟ جا ئەگەر نەریتەكان لە بەردەمی راوەستان لە دیدی وی وا دەخوازێ ئەو نەریتانە هەپرون بە هەپرون بكرێن و لابدرێن.

دروستگە و كۆمپانیاكان هەلی ئاتاجی لەرادەبەدەری ژنانیان قۆستەوە و بە كرێیەكی كەمتر لە هی پیاوان وەكاریان خستن ئەگەر چی هەمان كاریان لە هەمان ژمارەی سەعاتیش ئەنجام دابا.

رژدی و بەرچاوتەنگیەكی وا نە هیچ لۆژیك و دادگەری و نە هیچ ویژدانێك پاساویان نەدەدا. لەگەڵ ئەوەشدا هاتە بون و وەكو شتێكی سروشتی كە هەر پێویست بێ هەبێ، بەردەوام بو.

بەمشێوەیە ژنان بونە خاوەن دۆزێك.. دۆزی یەكسانی لەكرێ.[1]

ئەم رەوشە بەگوێرەی ئافرەت كەونینە بو، هەر لە شۆرشی پیشەسازیەوە لەگۆرێ بو. بەڵام لەچارچێوەیەكی تەنگەبەر، زیاتر لە حاڵەتگەلێكی تاكەكەسی دەچون، بەڵام ئەمرۆ كە ژنان تێكرا ئیش دەكەن بوە بە دۆزێكی گشتی و جەنگێكی گەرم ۆ هەڵایساو.

ئافرەت لە تێكۆشانی خۆی هەمو چەك و تفاقێكی جەنگی خستە كار.

---

١ ئەم دۆزە بە هەمو داخوازی و ململانێكانیەوە كۆنە و لەگەڵ شۆرشی پیشەسازی سەریهەڵداوە.. بەڵام لە ساڵانی شەر بەدواوە توندوتیژتر بو.

نارەزایی دەربڕین و مانگرتن و خۆپیشاندان و گەفوگوڕکردن.

لەگەڵ هەندێش هیچ ئەنجامێکی دەسنەکەوت، یـا هـەندێك ئـەنجامی لاوەکـی دەسکەوت کە ئامانجەکانی نەدەپێکا.

جا ژن وای بۆچون هەتاکو لە سەرچاوەی یاسادانان دورین هاوار و رۆرۆیان هیـچ سودێکی نابێ.

بۆیە دەبێ لە پەرلەماندا دەنگێکی بیسراویان هەبێ.. یـا دەبـێ بـەخۆی وەزور کەوێ یا بەلای کەم مافی دەنگدانی هەبێت.

ئەوجا رابو داوای ئەمە و ئەوی دەکرد.

ئەوکات رەوشی دۆزەکە گۆڕا و، بە تەنێ یەکسانی لەکرێدا نەما. کێشەی پێشو لەسەر دراو و درهەمان بو.. هی ئەمڕۆ لەسەر بنچینەیە.

پیاو لەسەرەڕێ راوەسـتا و دەیگـوت ئەمـە مـافی منـە و هـی ژن نیـە. مـن دەسەلاتی یاسادانانم، من یاسا دادەنێم و حوکمڕانی دەکەم. من یاساکان بۆ کۆمەڵ دادەڕێژم و منم ژیان رێك دەخەم.

ژنیش هەستانەوە و-لە کاتێکدا لە سەرەتای کارەکـەدا تەنـها داوای یەکسـانی لەکرێی دەکرد- گوتیان؛ ئێمە لە ئەفرین[1] یەکسانین. لـە قـەوارەدا یەکسـانین. لـە مافەکان و ئەرکەکانیشمان یەکسانین. ئێمە لەگەڵ پیاو وەك یـەکین. هیـچ لەئێمـە چاکتر نیە و چی لەئێمە زیاتر نیە.

کێشە و ململانێکە درێژ و تاڵ بو. ئێستا هەر بە یەکسانبون لەکرێ و یەکسـان بون لە دەنگدان یان یەکسانبون لە چونە پەرلەمان یا یەکسان بون لە پیشەدا..تاد.

---

١ ئەفرین: خلق.

رانەوەستا. بەڵكو داخوازی بو بە یەكسانبونی تەواو و رەها لە هەمو كاروبــارێكدا بەبێ ئاوارتن[1]

پیاو گوتی: ئاین پیاوی لــە پایــەكی هــەورازتر لــە ژن داناوە و ژنــی كردونــە پاشكۆی پیاوان.

هەروەها گوتی: رەوشت و نەریتەكان وا دەخوازن ژن بۆ ماڵێ و بــۆ مــێركردن و خێزان بن، نەك بۆ ئیش و كار و ململانێی ناپەیداكردن.

وایلێهات ژن نەفرەتی لە رەوشت و نەریتەكان كــرد و بەرەبــەرە خــۆی لــە دۆزی ئاین داماڵی.

بە جەخت و پێداگرتن كەوتەڕێ و دەروی هەمو بوارێكــی بــە تونــدی و ركــەوە دەكوتا تا لێی وەئاگا هات و وەڵامی دەداوە.

داوای كــرد سیســتەمی خوێندنــی وەك كــوڕان بــێ، پاشــان داوای خوێندنــی تێكەڵاوی كرد.

داوای كرد بچێتە زانكۆ، پاشان ویستی بچێتە هەمو كۆلیژێك كە لە پێشدا بــۆ كیژۆڵان قەدەغە بو.

داوای هەمو جۆرە پیشە و كارێكی كرد، داواكەشی دۆخێكی لۆژیكی وەرگــرت كاتێك لەگەڵ كوڕە لاوان هەمان زانست و دەرسی خوێند.

پاشان بەشێوەی پیاوان، داوای ئازادی لــە رەوشــت ئــازادبونی كــرد داواكەشــی لۆژیكی بو مادامەكێ كە كۆمەڵگە رێگەی بێڕەوشتی بەپیاواندا.

ئەگەر-لەو كاروبارانەی لەدەست خۆی نین- چاوەڕێی رازیبونی پیاو با، ئەوا لــە كاروبارانەی كە هەر لەدەستی خۆی دابون، پرسی كەســی نــەدەكرد و بــە هــەوای

---

١ ئاوارتن: استثناء

رازیبونی پیاوێك نەبو.

ئەوجا هات و لە چەقی رێ پەردەی ئابڕو و شەرمی دڕاند و، بەخۆی داوای رابواردنی سێکسی کرد و، هەرکەسێکی خۆی بیویستبا خۆی دەدا دەست و داخوازیەکانی فرۆیدی لەگەڵ بەسەر دەبرد.. داخوازیەکانی ئاژەڵ.

لە سەرەتا پیاو زۆر بەهار وهاجی هەڵچو.. بۆ کەرامەتی برینداری بۆ سیمای بە میرات بۆ بەجێماوی.

زۆری نەخایاند ئەویش هاتە رایێ.

کە لەگەڵ خۆی لێکی داوە دیتی سەودایەکی بە قازانجە..

ئەو ژنەی کەوا کاردەکا، هێندێك مەزی ژیانی لەسەر سوك دەکا. دو داهاتیش هەڵبەت چاکترە لە یەکێك. ئافرەت چەندیش بۆ خۆی و خۆڕازاندنەوەی بگێڕتەوە، هێشتا لە بەشێك مەز و خەرجی ماڵ دەبێتە هاوبەش. ئەمەش دەسکەوتێکە بڕێك باری لەسەر دڵی وەلا دەبا.

لەلایەکی دیکەشەوە دەرکەوتنی ژنان لە رێگەوبانان بە ئاسانی هاتە ئارا و، ئاسان دەسدەکەوت و، مەسەلەیەکی خۆشیشە، کابرا لە هەرکوێ بێ چاوی بە ژنان دەکەوێ و چێژ لە دیتنی ئەو جوانی و عیشوە سەرنج راکێشانە وەردەگرێت. لە هەر شوێنێکیش بیەوێ لێی نزیکە، بەحوکمی هەواڵێتی لە کار، یا هەواڵێتی خوێندن، یا هەواڵێتی رێگە.. بە هەواڵێتی داماڵران لە رەوشت و ئازاد بون لە کۆتەکانیش لێی نزیکترە.

لە پاشاندا ژن بەمشێوەیە جوانە و... ژیانیش پرشنگدار و رون دەبێ و.. رابواردنیش دەسدەکەوێ و.. تا ئەوپەڕی رابواردنیش مەحاڵ نیە.

پیاو بەو سەودا پڕ لە قازانجـە رازی بـو. چیدیکـەش بـۆ کەرامـەتی بریـنـدار و سـیمای بـۆ بـەجێماوی هەڵنـەچو. بـەڵکو بـەخۆی بـوە بانگبـەری ئــازادبون و، داخوازکاری بەخشینی مافەکان بە ژن.

ئەمەش بە سەردەمی ئازادبونی ژنان و بەرزکردنـەوەی بـۆ ئاسـتی مرۆڤایـەتی ناوزەد کرا.

❊ ❊ ❊

ئەمـە تاکـە بـوار نـەبو جـەنگ کـاری تێکردبـێ و، بــەها و چەمکــەکانی ناوەژۆکردبێتەوە، یــان-لــەواقیعدا- ئــەوەی پێشـو هــەبو گــەورەی کــرد و بــواری بەرەلابونی بۆ رەخساند.

رچەی ماددی لە ئەوروپا گەلـێ کـۆن بـو، پـەلکێکی تەنکۆڵـەی مەسـیحێتی داپۆشیبو، کە لە ویژداندا مەلاس بو و هێندێك تێڕوانینی دەڕەنگـاند، ئەگـەرچی حوکمیشی بەسەر زۆر لە واقیعی ژیاندا نەبو.

لەگەڵ تیۆرە یەك بەدوایەکەکانی کە لە سەدەی هەژدە و نۆزدە دامەزران و، بـە تایبـەتیش، تیۆرەکـانی (داروین) و (فرۆیـد) و لێکدانـەوەی مـاددی بـۆ مێـژو، ماددیەت هێندەی تر رەگی داکوتا و، پەلکەکەی مەسیحێتیش هێندی تر تەنکۆڵە دەبو. ئەوجا ماوەی جەنگ و دوای جەنگ بوە مــاوەی پێکداکێشـانی شـێتانە بـۆ دەسەلاتدار بون لە زەوی.

پێکدا کێشانی شــێتانە بـۆ دەســەلاتداربون لـە زەوی، پێکـدا کێشــان لەســەر زێدەبونی بەرەهەمهینانی ماددی و، پێکداکێشان بــۆ دەسبەســەر داگرتنــی هــێزە مرۆڤانەکان و، پێکداکێشان بۆ یەکتر لابردنی وڵاتان.

زۆرانێیەکی ترسناك لە جیهانی ماددەدا، بەهیچ مەبدەئێك پەیوەست نیە و یەك ساتیش گوێ ناداتە بانگەوازێکی بەرز..

لە هەمان کات شەیدابون بە زانست زیادی کرد، لە رۆژانی شەڕدا توانا زانستیەکان بۆ بەرهەمهێنانی کاولکاری تازە خرانە گەڕ. پاشانیش بۆ دەسخستنی ئامرازەکانی ئاوەدانکردنەوە لەو وێرانیە سەرتاسەرە و، ئامرازەکانی زاڵبون لە گۆڕەپانی بەرهەمهێناندا.

پێشکەوتنێکی سەرسوڕهێن لە بواری زانست و جیهانی داهێناندا رویدا.

پێشکەوتنێکی وا کە هاوسەنگی مێشکەکانی تێکدا بەجۆرێك کە زۆر بەسەری بەرامبەر ئەو ئەرژەنگە نوێیە راوەستان.

لە پێشوشدا، لە رۆژانی (کۆپەر نیکۆس) و (گالیلیۆ) و دواتر (داروین) ئەوانی دیکەی پاش ئەویش، زاناکان وەکو دوژمن لە روی کڵێسا ڕاوەستان و، خەرەندێکی گەورە لە نێوان زانست و ئاین دروست بو.

جا لەو بار و زروفەی پێشتر شرۆڤەمان کرد زانست بەسەر کڵێسادا سەرکەوت.. ئاوجا لەگەڵ بونەوەی هەر گۆڕەپانێکی دیکە بە روی زانستدا جودایی لە نێوان زانست و ئایین زیاتر دەبو، لەو کاتەی ئاین لە قوڵغەی کڵێساکاندا مۆڵی خواردبو و نەیدەتوانی بۆ نێو ئاپۆرای سەر رێگا وەدەرکەوێ.

ئەوجا گومڕابون بەرپا بو ئەو کاتەی خەڵك -زانایانیش- وایان بەخەیاڵدا هات کە بەسەر یاساکانی سروشتدا زاڵ بون و تەنیا چەند هەنگاوێکیان ماوە ژیان خەلق بکەن.

ئەو دەمی بو ئەورووپا خوای خۆی فڕێدا و -هەر وەك (سۆمەرسێت مۆم) گوتویە- بڕوای بە خودایەك هێنا ناوی زانست بو و، یەکجاریش لە بیرۆکەی خودا

و دینداری و، هەمو بەها و چەمکێکی ئاین کە پێشتر داپڕشتبو، خۆی دامـاڵی و، وای بە خەیاڵدا هات کە لە توانای دا هەیە -تەنانـەت ئـەرکی خۆیـەتی- ئـەمڕۆ تێکڕای بەها و چەمکەکانی خۆی داڕێژێ، نەکەوێتە بەر وەسیەتی کەس جـا خـودا بێ یا غەیری خوا. ئەمڕۆ لەو کۆتە ڕەهابو و پێویستی بە وەسیەت نەما!

ئەمڕۆ هەروەك (جۆلیان هێکسلی) دەڵێ: مرۆڤ هەر خۆی دەپەرستێ. مـرۆڤ هەر بەخۆی خودایە.

ئەمەش بە چاخی سەرکەوتنی مرۆڤ بەسەر سروشت و رزگاربون لـە پڕوپوچـان ناوزەد کرا.

***

ئەمانە ئەو فاکتەرانە بوون کاریگەریان بەسەر ئـەوروپادا هـەبوو بـە داڕمـانی ئاین و ڕەوشت و نەریتەکان کۆتایی هات.

جا لەگەڵ لاوازی ئاین لە ئەوروپا و، لەگەڵ ئەوەی هـەر -بەتـەنیا- ڕوکەشـێك بو، ئەوجا دو سەدەی تەواو کاتی ویست. دو سەدەی تەواو ئـەو کوتکـە بەهێزانـە بەدوای یەك کەللەیان دەکوتا و، لە گشـتلا دایاندەڕوخـاند، هـەر یەکـەی دەسـتی پێدەکرد ئەوی دیکە یەکسەر بەدوایدا دەهات و لەپاڵ ئـەودا دەسـتی بـە کوتانـێ دەکـرد... سـەرەڕای لاوازی و لـە باریـەکچونیش هێشـتا کۆنـە بنیاتەکـە خـۆی ڕاگرتبو.. تا لە کۆتاییدا لەرزەی کەوتێ و داڕما.

ئێمـەش -هـەتاکو ئێسـتا- ئـەو فاکتەرانـەمان دەخسـتە ڕوو.. لـەو ژینگـە مێژووییەی دەمانخستەڕو کە تێیدا روان و گەرایان دانا، بـەلام وتوێژمـان لـەبارەی نەکرد و ئەو هەڵە و ڕاستیانەی تێی دان نەمان پشکنی.

ئەو بانگەشانەی یەك بەدوای یەك هاتنە ئارا و شالآویان بـۆ ئـاین و رەوشـت و نەریتان دەهێنا و بەرەو روخانیان دەبردن..

ئایا هەموان ڕەوان؟

یا هەمو نارەوان؟

یاخود لە هەمان کاتدا.. رەوان و نارەوان؟

# رەواكان و نارەواكان

لە بەندی رابردودا كۆمەڵێك تێڕوانینی ئەوروپیانەمان لە پێش (داروین) و پاش (داروین) لە بارەی گەردون و ژیان و مـرۆڤ خسـتە ڕو و.. بینیمـان چەمكـەكانی ئاین و رەوشت و نەریتان لەگەڵ هەمو ئەو هەست و تیشكدانەوانەی دەوریان داون، چۆن دەلەرزین و دەهەژان و.. لە كۆتاییشدا دەروخان.

كاتێك مرۆڤ رادەوەستێ -هەروەك ئێمە لەبـەندی پێشـودا وەسـتاین- و چـاو دەداتە ئەو هێڵە درێژەی ڕۆچون و كەچڕۆیینی[1] بەردەوام. سەراسیمە دەبـێ لـەوەی كـە ئـەو تـێڕوانین و بۆچونـە لـەرزۆك و شلوشـۆق و شـێتانەیە هـی مـرۆڤ بـن. مرۆڤگەلێكیش كە خۆیان بە پێگەیشتو و، فێرخواز و زانا دادەنێـن، مرۆڤگـەلێك خۆیان بە خەڵك دادەنێن و گوایە لە تاریكی چاخەكانی نێوەڕاسـتەوە دەركـەوتون، بەرەو ڕوناكی ڕەواناسی كە كەسی تێدا گومڕا نابێ.

مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ كە ژیـار[2] لەسـەر ئـەجۆرە تێڕوانینانـە بێتـە ئـارا. ژیارێك كە بەخۆی بڵێ ژیاری راستەقینە و، لەو بـترازێ هـەمو ژیارەكـانی پێشـو بەگوێرەی وی قۆناغێكی منداڵی یا دواكەوتویی یاخود تـاریكی بـن. ژیـارێك كـە

---

١ ڕۆچون: تدهور    كەچڕۆیین: انحراف

٢ ژیار : حضارة

دەڵێ بۆ خۆی ترۆپکێکە هەمو ترۆپکەکانی دی و بەها و شتەکانی دیکە، لە پاڵی گرگن[1] دەنوێنن.

مرۆڤ سەراسیمە دەبێ.. ئەگەر ئەمرۆ لەم ژیارە نیشانەکانی داڕزان و داڕمانی نەدیبا.

ئەو شاڵاوە نفوراتە گەیشتە ئەوپەڕی، پاشان بەرەو پەنگخواردنەوە چو.. دەستی بە دابەزین کرد و، (پیاوی سپی)شی لەگەڵدا دابەزی. ئەو پیاوەی چەندین هێندەی ئامرازە راستەقینەکانی پێشکەوتن و ئامرازەکانی ئاواکاری گەندەڵی لەسەر زەویدا هێنا ئارا. ئەو پیاوە -پێش ئەوەی ئەو سەرکردایەتیە جێ بێڵێ کە دو سەدەیە لە دەستی دایە- هێندەی نەماوە سەرتاپای جیهان وێرانکا و لە بنوبۆتکەوە هەڵیتەکێنێ.

بەڵێ. پیاوی سپی سەروەرایەتی خۆی لە دەستدا.. ئەو کەسی واش دەڵێ، فەیلەسوفی هاوچەرخی ئینگلیز (بێرتراند راسل)ە کە بەخۆی سپیە و بنەچەشی هەر سپییاتن و ئەو مەبەستەشی بەر لە چەند ساڵێك بەراشکاوی راگەیاند و بڵاوی کردەوە[2] سەروەرێتی خۆی لەدەستدا چونکە هیچی لەدەستدا نەما و بیرۆکەیەکی شیاوی پێنەما بە مرۆڤایەتی ببەخشێ. ئەو هزرە چاکانەی لەلای بون، شەڕەنگێزی مۆڵخواردوی نێو تێڕوانینە لاڕێکانی باڵیان بەسەردا کێشا بو. ئەو ڕەوایانەی لاشی بوە نارەوایان بەسەردا زاڵ ببو.

***

---

١ گرگن : قزم، ضئيل

٢ بێرتراند راسل یەژێ: "ئەو سەردەمە بەسەرچو و هاتە کۆتا کە پیاوی سپی تێدا سەروەربێ. مانەوەی ئەو سەروەرێتیەش تا هەتایێ یەکێك لە یاساکانی سروشت نیە. بیروباوەڕم وایە پیاوی سپی ناگاتەوە رۆژانێکی خوشنودی وەك ئەو چوار سەدەی تێپەڕین.

لە بەندی رابردودا هەنگاوەکانی زەمەنمان لە ئەوروپادا خستە ڕو، لەگەڵ ئەو کاریگەریەی بەسەر هزر و هەست و ژیانی کردەکیانەی خەڵکی هەبو.. لەم بەندەشدا دەمانەوێ وتوێژ لەو تێڕوانینانە بکەین کە لەپاش (داروین) بڵاوبونەوە و تێڕوانینی مرۆڤی بۆ خۆی و مەڵبەندی خۆی لە گەردون و، ئەرکی لە ژیاندا گۆری و -پاشانیش- هەمو شتێکی تێدا گۆڕی.

ئەوانە کۆمەڵە تێڕوانینێکی لێکدی جودا و بەهەمو ئاراستەیەکدا بون، لە سیاسەت و، لە کۆمەڵایەتی و، لە ئابوری و، لە دەرونزانی و، لە فەلسەفە و، لە ئەدەبیات و لە هونەرەکان.. بەڵام تێکڕا لەسێ تێڕوانینی سەرەکی کۆ دەبنەوە:

١-ئاژەڵێتی و ماددیەتی مرۆڤ.

٢-پەرەسەندنی بەردەوام کە بیرۆکەی گۆڕان دەسڕێتەوە.

٣-حەتمیەتی ئەو پەرەسەندنەی کە دەست و ڕا و هەڵبژاردنی مرۆڤی تێدا نیە.

جا لکو پۆپ و پیادەکردنەکان لەم سێ تێڕوانینە سەرەکیەوە سەریانهەڵدا هەتا هەمو چالاکیەکی مرۆڤانەی داگرتەوە.

* * *

داروین پاڵەوانی راستەوخۆی ئاژەڵێتی مرۆڤ بو.. لە کتێبی (بنەچەی مرۆڤ) فروسمانێکی بەهێزی بە ئاژەڵێتیەکی دابو، هەمو تێڕوانینە ئاینی و فەلسەفیەکانی پێشوی رەتکردەوە کە ئەو بونەوەرە مرۆڤانەیان لە شوێنپایەی چاکتر بون و تاکبونێدا دانابو.

ئەوجا بەپێی ئەمە تاکبونی مرۆڤی لە سیستەمگەلێکی کۆمەڵایەتی و رەوشتی تایبەت بەشێوازێکی لۆژیکیانە رێکخست کە هیچ بونەوەرێکی ناسراوی دیکە نەیانبو، ئەمانەش هەر مرۆڤ بون بەسەر ئاژەڵدا، هەروەها لە بەندی پێشودا

وامان باسکرد پێویستی دوبارەکردنەوە نەکات: کە چۆن تێڕوانینی ئاژەڵانەی مرۆڤ بۆ خۆی، بوە هۆی زنجیرە تێکشێوانی هزری و رەوشتی و کۆمەڵایەتی یەك بـەدوای یەك کە لە سنورێکدا رانەدەوەستان.. ئەگەر ئەمڕۆش -بە لۆژیـك و بـە زانسـت- بۆمان سەلما کە ئەم تێڕوانینە لە بنچینەڕا هەڵەیە، ئەوا هەمو ئەو چەمکانەی کـە لێیانەوە هەڵێنجرابون و لەسەریان بنیات نرابون لە بناغەوە داڕوخان کە پێشتر لـەو دو سەدەیەی رابردو رۆژاوایان سەراسیمە کردبو و، لـەم سـەدەیەش -وەکـو پـەتا- ئێمەیان سەراسیمە کرد.

هەروەها ئێمە گفتوگۆی (داروینیزم) ناکەین لەبارەی ئاژەڵایەتی مرۆڤ. بـەڵکو زانایەکی (داروینیستی) نوێ کە (جۆلیان هێکسلی)ە لە کتێبی (مرۆڤ لە جیهانی نوێدا) گفتوگۆی ئەم مەسەلەیە دەکات.

-با خوێنەریش ئارخـەیان و خاترجـەم بـێ-، -سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوا- خانـەوادەی هێکسـلی هـەمویان هـەر بێبـاوەڕن، لـە هەموشـیان فەرمەسـۆنتر (جۆلیان)ی گۆرینە کە ئێمە لێرەدا قسەکانی رادەگوێزین، هـەر ئـەم لـەو کتێبـەی دەڵێ:

خودا -ی پاك و بەرز- خورافەیەك بو مرۆڤ بـۆ خـۆی هێنایـە بـون هـەتا لـە کاتـەکانی هەسـت بەتـەنیایی کـردن لـەو گەردونـە، ببێتـە مایـەی دڵنـەوایی و دڵدانەوەی، ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە ئەم پڕوپوچە تورِ هەڵدرێ و، مرۆڤ خۆی لە شوێن خوا دانێ.

بەڵێ. بـا خوێنـەر خاترجـەم بـێ ئـەوەی (لـە بـارەی مرۆڤایـەتی) گفتوگـۆی (داروینیزم) دەکات. زانایەکی (داروینیستە) و تەنانەت یەك دڵۆپ بڕوای لـەناو دڵ و دەرون نیە.

(هێکسلی) لەژێر ناونیشانی (تاکبونی مرۆڤ)دا دەڵێ:

((بیروڕا و بۆچونی مرۆڤ لەبارەی جێگەی خـۆی بـەگوێرەی ئـاژەڵانی دی وەك بەندۆڵ لە نێوان سەرسـام بونـی زۆر و کـەم بـەخۆی جۆلانـەی دەکـرد، کـەڕەتێك کەلێنێکی گەلێك گەورە لە ئاژەڵانی دادەبـڕی و کـەڕەتێکی دیکـەش کـەلێنێکی یەکجار گچکە، بێگومان دەکرێ ئەو کەلێنەش گەورە یاخود گچکە بکرێ. جا لـە لایەن ئاژەڵان بێ یا لە لایەن مرۆڤەوە.. هەروەها مرۆڤ دەتوانـێ -بـەو شـێوازەی (دیکارت) کردی- ئاژەڵان بەوێنەی ئامێر رابنوێنێ، یان -وەکو زۆربەی خـەڵکانی ساکار دەیکەن- گەلێك سیفەتی مرۆڤی بدەنە پاڵ.. هەروەها مرۆڤ دەتوانـێ کـار لەسەر لێواری مرۆڤانەی کەلێنەکە بکا. جا ئەوکاتە یان توخمی مرۆڤانەی خۆی لـە سیفەتەکانی دادەماڵێ و دەیخاتە خانەی ئاژەڵان، یا زۆر بەرزی دەکاتەوە و دەیخاتـە نێزیك فریشتان.

((.. بە دەرکەوتنی تیۆرەکەی (داروین) بەندۆڵەکە بـەراوەژو کەوتـە جـۆڵان و، جارێکی دی مرۆڤ بە ئاژەڵ دانرا.. بەرەبەرە بەندۆڵەکە گەیشتە ئەوپـەڕی ئاسـتی جولانەوەی، ئـەو شـتانە دەرکـەوتن کـە بـە دەرەنجـامی لۆژیکیانـەی فـەرەزیاتی (داروین) دەچون! مرۆڤ (وەك ئاژەڵانی دی) ئاژەڵێکە بۆیە بیروڕایەکانی دەربـارەی مانای ژیانی مرۆڤانە و بـەها بـەرزەکان لـە بـیروڕای کرمـی شـریتی و بـەکتریای باشلیس زیاتر جێگای ڕێز و تەقدیر نیە. مانەوەش تاکە پێوەری سەرکەوتنی گەشە ئامێزە. هەر بۆیەش هەمو ئەو بونەوەرە زیندوانەی هەن لە نرخ و بەها یەکسـانن. بیرۆکەی بەرەو پێشچونیش بێجگە لە بیرزایەکی مرۆڤ هیچی دیکە نیـە. ئـەوەش بەڵگە نەویستە کە ئێستا مرۆڤ سـەروەری ئافەریدانـە، بـەڵام ڕەنگـە کتك[1] یـان

---

١ کتك: پشیلە.

مشك سبەی جێگای بگرنەوە..

((لێرەدا ئەم کەلەبەرە بەهۆی زێدە بەخشینی سیفەتی مرۆڤانە بە ئاژەڵان بچوك نەبویەوە، بەڵکو لەئەنجامی کەمکردنەوەی سیفەتگەلی مرۆڤانە بو لە مرۆڤ. لەگەڵ ئەمەشدا بەمدواییە ئاراستەیەکی نوێ هاتە ئارا کە هۆیەکەی زۆر جاران بۆ زێدەبونی مەعریفەت و فراوان بونی چوارچێوەی شیکردنەوەی زانستی دەگەڕێتەوە.

((وا دوبارە بەندۆلەکە کەوتە جوڵان و، جارێکی دی کەلێنەکەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ فراوان بو، هەر لە دوای تیۆری (داروین) مرۆڤ نەیکرا خۆی لە بە ئاژەڵ ژماردن لابدا، بەڵام خۆی وەك ئاژەڵێکی یەکجار نامۆ لە زۆر حاڵەتیش بێ وێنە هاتە بەرچاو، جا شیکردنەوەی تاکبونی مرۆڤ لە روی بایۆلۆجیەوە هێشتا نەگەیشتۆتە ئەوپەڕی ئەم وتارەش بێجگە لە هەولێکی خستنە ڕوی شوێنی ئێستای چیدی نیە.

((یەکەمین تایبەتمەندێتی باڵا و لە هەموان ئاشکراتر هەبونی توانای بیرکردنەوەی وێنەییە.. جا ئەم سیما بنچینەییە لە مرۆڤدا گەلێك ئەنجامی هەبوە، گرنگترینیشیان گەشەی نەریتە رو لە زیادەکان بو.. لە گرنگترین ئەنجامەکانی زیادبونی نەریتەکانیش -یا ئەگەر دەتەوێ لە گرنگترین دیاردە°راستەقینەکانی- ئەو کردەوانەیە کە مرۆڤ بۆ چاکتر کردنی مادده و ئامرازەکانی بەردەستی ئەنجامیان دەدا.. نەریتەکان و ماددەکانیش ئەو تایبەتمەندێتیانەن کە مرۆڤیان بۆ چەقی سەروەرێتی ئامادە کردوە لەنێو زیندەوەراندا. ئەم سەروەرێتیە بایۆلۆجیەش -لەم سەردەمەدا- سیمایەکی دیکەیە لە سیما بەرزەکانی مرۆڤ..

((.. بەمشێوەیە ژیانزانی[1] مرۆڤ لە پلە و پایەیەك دادەنێ هاوشانی ئەو

---

[1] ژیانزانی: علم الحیاة.

نیعمەتەیە وەك سەروەری وەدیهێنراوەکان (سید المخلوقات) پێدراوە، هەروەك ئاینەکان دەڵێن، لەگەڵ ئەمەشدا جیاوازی هەن، جیاوازیەکان هەندێك گرنگیشن بەگوێرەی تیۆرە گشتیەکەمان، لە تێڕوانینی بایۆلۆجیەوە ئاژەڵەکانی دیکە بۆ خزمەتی مرۆڤ وەدینەهێنراون، بەڵکو مرۆڤ بەشێوەیەك گەشەی سەندوە کە وایلێکردوە بتوانێ خۆی لە هەندێك جۆری رکابەری دەرباز بکا و، دورخستنەوەی جۆرەکانی دیکە بە ڕاهاتن (استئناس) و، چاکردنی بارە سروشتی و بایۆلۆجیەکان لە زۆربەی بەشەکانی وشکانی گۆی زەوی و، تێروانینی ئاینیش لە وردەکاریەکان و لە زۆربەی ئەو شتانە راست نەبو کە لە خۆی گرتبون، بەڵام بناغەیەکی جیۆلۆجی پتەوی هەبو[1]

((جا قسەکردن و نەریتەکان و ماددەکان بونە هۆی گەیشتن بە گەلێك تایبەتمەندێتی دیکەی مرۆڤ کە هاوشێوەی لە نێوان وەدیهێنراوەکانی دیکەدا نیە و، زۆربەشیان ئاشکرا و ناسراون..

((مرۆڤیش وەك جۆرێکی دەسەڵاتدار هاوشێوەی نیە، چونکە جۆرە دەسەڵاتدارەکانی دیکە بۆ سەدان و هەزارانێکی زۆر لە جۆری لێکجیاواز دابەش بوینە و، لە رەگەز و پۆل و کۆبونەوەی گەورەتردا کۆبوینەوە. بەڵام مرۆڤ بەبێ دابەشبون سەروەرێتی خۆی پاراستوە، جۆراوجۆری رەچەڵەکەکانی مرۆڤیش لە سنوری یەك جۆردا تەواو بوە.

---

١ جۆلیانی –کە بێباوەڕە– ناتوانێ تەواو تەسلیم بێ کە تێڕوانینی ئاینی راستە و، مکوڕە کە بلێ هەڵەی تێدا بو، لەگەڵ ئەوەشدا ناچار بوە بلێ پشتی بە بناغەیەکی جیۆلۆجی پتەو بەستبو– واتە راستە، ئێمەش لێرەدا رای ئەومان –بەهەر جۆرێك بێ– بە تەواوی و بەبێ لابردنی ئەو شتانەی لەگەڵیدا کۆك نین وەکو خۆی گواستۆتەوە، جا لەگەڵ خوار و خێچیەکانیشی دەلالەتی ئاشکرای هەن.

((لە کۆتاییدا مرۆڤ هاوشێوەی لە نێوان ئەو ئاژەڵانە دا نیە کە لە شێوازی گەشەسەندنیاندا باڵان.

((مرۆڤ تایبەتمەندێتیەکی دیکەی بایۆلۆجی هەیە، کە بریتیە لە تاکێتی مێژوی گەشەسەندنی.

((ئێمەش ئێستا لە ئاستێکی وادایین ڕێگەمان پێدەدا پێناسەی تاکێتی مرۆڤ لە گەشەسەندەکەیدا بکەین. تایبەتمەندێتی جەوهەری مرۆڤیش وەك بونەوەرێکی زیندوی باڵادەست بریتیە لە بیرکردنەوەی واتایی.

((.. لێکۆڵینەوەکەمان تا ئێستا بە شێوازێکی گشتی لە تایبەتمەندێتیەکانی مرۆڤ بو لە لایەنی گەشەسەندن و بەراوردکردن و، ئێستاش دەگەڕێینەوە سەری و کەمێك بەدرێژی لەگەڵ ئەنجامەکانیدا لێی دەکۆڵینەوە. یەکەم جار نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە جیاوازی لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ لەروی عەقڵەوە زۆر مەزنترە لەوەی خەڵك بۆی دەچێ.. هەموشمان ئاگادارمان لەهێزی غەریزەی مێرواندا هەیە.. بەڵام مێرو لە دۆزینەوەی ڕێگەی تازەدا کەنەفت دیارە.. مەمکدارەکانیش[1] لەوان چاکتر نین.. لەکاتێکدا بیرکردنەوە لەلای مرۆڤ بایەخێکی بایۆلۆجی گەورەی هەیە، تەنانەت کاتێکیش کە داب و هەوڵدان و هەڵە بیرکردنەوەشی دادەگرێ، رەفتاری ئاژەڵانیش هەر دەبێ عورفی بێ واتە لە سنورێکی تەسکدا جێگیرن، هەرچی مرۆڤە لە رەفتارەکانیدا تا ڕادەیەك ئازاد بوە —لە بەخشین و وەرگرتندا وەك یەك ئازادە..... ئەم نەرمونیانیە(مرونة) زیادەش ئەنجامی سایکۆلۆجی دیکەیان هەیە کە پیاوانی فەلسەفەی عەقڵی لەبیر خۆیانی دەبەنەوە و، مرۆڤیش لە هەندێکیاندا ناوازەیە، ئەم نەرمێتیەش بۆ نمونە بۆتە هۆی ئەوەی مرۆڤ ببێتە تاکە بونەوەری

---

١ کەنەفت: عاجز. مەمکدارەکان: ثدییات.

زیندو کە دوچاری کێشەی دەرونی ببێ.. لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی بۆ چونە نوێیەکان (لە مرۆڤدا) ئەندام هەن بۆ کەمکردنەوەی کێشەی دەرونی تا ئەوپەڕی، کە دەرونزانان بە خەفەکردن و دامرکاندن[1] دەیانناسێنن.

((جا ئەم تایبەتمەندێتیانەی مرۆڤ هەیەتی و، دەکرێ بەدەرونی ناو ببرێن پتر لەوەی بایۆلۆجی بن، لەسەر یەکێك یان زیاتر لەم سێ تایبەتمەندێتییەی خوارەوە دادەمەزرێ:

((یەکەم: بونی توانای بیرکردنەوەی تایبەتی و گشتی.

((دوەم: یەکگرتویی ڕێژەیی کردارە عەقڵیەکان بە پێچەوانەی دابەشبونی عەقڵ و ڕەفتار لەلای ئاژەڵدا.

((سێیەم: هەبونی یەکەی کۆمەڵایەتی وەك هۆز و نەتەوە و حیزب و بیروباوەڕ و، دەسگرتنی هەر یەکەیان بە نەریت و ڕۆشنبیری خۆی.

((گەشەی عەقڵ لە قۆناغی پێش مرۆڤ تاکو قۆناغی مرۆڤ گەلێك دەرەنجامی لاوەکی هەبوە، کە بێگومان لەروی بایۆلۆجیەوە ناوازەن، لەوانەش زانستی ماتماتیك و بەهرە مۆسیقاییەکان و، داهێنانی هونەری و ئاین و، خۆشەویستی نمونەیی..

((بەڵام لێرەدا هێندە بەس نیە هەندێك روی چالاکیەکان بژمێرین، لە ڕاستیدا زۆربەی روەکانی چالاکی مرۆڤ و تایبەتمەندیەکانی ئەنجامی لاوەکی تایبەتمەندێتیە بنەڕەتیەکەن، بۆیە بەهەمان شێوە ئەمانەش لەروی بایۆلۆجیەوە بەرزن..

((ڕەنگە تاکبونی مرۆڤ ئەنجامی لاوەکی دیکەی هەبن تاکو ئێستاش سودیان لێ وەرنەگیرابێ.. تاقیکردنەوەکانی کە (بین بریل) ئەنجامیدان لەبارەی هەڵهێنان

---

[1] خەفەکردن: کبت. دامرکاندن: قمع.

(حدس) بەبێ بــەکارهێنانی هەســتەکان و، ئەوانــەی (گیلبــەرت مــرای) لــەبارەی راگواستنی بیر و، زۆری نوسینی ناوەوە دەربارەی خوێندنەوەی بیر و داهاتو زانین وا دەخەنە دڵ کە هەندێ خەڵك هەن توانای زانینیان هەیە بەغەیری رێگــەی ئاســایی پەی پێبردن لە رێگەی هەستەکانەوە.

((بەمجۆرە رەنگە مرۆڤ زۆر ناوازەتر بێ لەوەی ئێستا پەی پێ دەبەین))[1]

رەنگە تۆزێك بەفراوانی دەقەکانمان لە کتێبەکەی جۆلیان هێکسلی گواستبێتەوە -زیاتر لەوەی ئەم توێژینەوە بچوکە هەڵیدەگرێ- بۆ ئەوە نا کە ئێمە پێویســتیمان بەوە هەیە کە قەناعەت بە تاکێتی مرۆڤ بێنــین، چونکــە تــاکێتی مــرۆڤ بەڵگــە نەویستێکە (مرۆڤ) پێویستی بە مشتومڕ و ماندوبون نیە تاکو بۆی رێنوێن بــێ، بەڵام ئێمە پێمان سەیرە چــۆن (جاهیلیــەت)ی ئــەوروپا بــەمجۆرە ســەیرە لەســەدەی نۆزدەمیندا لارێ بو، کاتێك -هەروەك هێکسلی گوتی- بڕوای بە ئاژەڵێتی مــرۆڤ هێنا و، چۆن زانایان سۆمایان تاریك بو و بەگــەڵ شــەپۆلەکە کــەون وە رێیــان لــە شێواندنی وێنەی مرۆڤ و بە ئاژەڵکردنی نەگرت..

نەخێر، دەقەکانمان لە کتێبەکەی (هێکسلی) بۆیە وابەفراوانی نەگواستەوە هــەتا قەناعەت بەخۆمان بێنین کە مرۆڤ تاکە و لە ئاژەڵ دورە.. بــەڵکو بــۆ ئەوەیــە تــا رونکەینەوە کە بەتەنیا ویژدانی ئاینی نیە کە گەیشتۆتە ئەم راستەقینەیە، بــەڵکو تەنانەت خودی (زانستیش)، ئەو زانســتەی پیــاوێکی بێبــاوەڕ دەیڵــێ کــە بــڕوای بەخودا نیە، پاش هەڵبەز و دابەز و ساتمەیەکی زۆر گەیشتە ئــەوەی کــە یەکــەمین تــێڕوانینی (داروینــی) -کــە عــەقڵ و رەوشــت و داب و نەریتــەکانی ئــــەوروپای گەندەڵکرد- راست نەبو، هەر چەند پشتیشــی بــە تیۆرێکــی زانســتی بەســتا بــو،

[1] لە کتێبی (الانسان في العلم الحديث) نوسینی (جولیان هیکسلی) وەرگێڕانی "حسین خطاب" و پێداچونەوەی (د. عبدالحلیم منتصر) بژاردەیەك لە ل١ تاکو ل ٣٦.

چونكە تیۆری زانستی شتێكە و، چۆنیەتی تێگەیشتن، یا چۆنیەتی ئاراستەكردن یا چۆنیەتی پێكاریگەربونی شتێكی دیكەیە، شتێكی دیكەیە كە ڕەنگە بەتــەواوەتی جودابێ.

زانستیش وزەیەكی (بێلایەن)ە لەخودی خۆی نە خێرخوازە و نە شەڕخواز، بــەڵام ڕێگەی بەكارهێنان و ئاراستەكردنی خێر یا شەڕی لێدەكەوێتەوە.

شتێكی حەتمیش نەبو -لە خودی تیۆری (داروین)، لەگەڵ كــەمی زانیاریــەكانی لــەوكاتی بەردەســت بــون و، كاریگــەری ئــەو كەمــە زانیاریــە لـــــە دەرهێنـــانی ئەنجامەكان- حەتمی نەبو كــە زاناكــان بــڕوا بــە ئــاژەڵێتی مــرۆڤ بێنــن، چونكــە پیادەكردنی تیۆری دروست بون و باڵا بون (النشوء والارتقاء) بەخۆی فروســمــانێكی وا دەبەخشێ كە مرۆڤ پێوەری تایبەتی هەن كە لەهی ئاژەڵ جوایەزە.. لە جیهانی ئاژەڵدا تا ئاژەڵ لە پەیژەی گەشەسەندندا سەركەوێ پێوەری تازە دەبینێ، بۆ نمونـــە ئەو ئاژەڵەی دوچاوی هەیە هەمان پێوەری لەسەر پیادە ناكرێ كە لەسەر ئاژەڵێكی پێشودا جێبەجێدەبو كە هەردو چاوی نەبون و، ئەو ئاژەڵەی شیر دەداتە بێچوەكانی لە ژیانی خۆیدا پێوەری جیاوازی هەن لــە پێــوەری بــاڵندان كــە هێلكــە دەكــەن و هێلكەكان لە باوەشدەگرن یان ئەو مێروانەی گەرا دادەنێـــن و بــۆ بــارودۆخ واز لــە گەراكە دێنن.. جا ئەو مرۆڤەی كە لە زۆر شتان لە ئاژەڵ باڵا تــرە، چــۆن پێــوەری تایبەتی جیا لە پێوەرەكانی ئاژەڵی نابێ!؟

(نەفامی) بو كە دو سەدەی ڕابردو ئەوروپای دەجوڵاند، لە جەرگەی ئەو كاتــەی كە خەڵك وایان بەخەیاڵدا دەهات كە زانست لەوێ ژیان ئاراستە دەكا.

كەواتە مرۆڤ مرۆڤە!!!

تەنانەت (جۆلیان هیكســـلی) كــە بــڕوای بــەخودا نیــە و، بڕواناكــا كــە خــودا مەبەستێكی لە وەدیهێنانی گــەردون و وەدیــهێنانی مرۆڤــدا هــەبێ و، بــڕوای بــە

(رۆحانیەت)ی مرۆڤ نیە و، هەرگیز لە قسەکانیدا باسی رۆحانیەتی نەکردوە.. تەنانەت ئەم (جۆلیان)ە دەڵێ مرۆڤ مرۆڤە و، لە مرۆڤایەتی خۆیدا تاکە.

سوپاس و ستایش بۆ خودا..

کەواتە هەمو رارەوە هزری و کۆمەلایەتی و ئابوری و سیاسی و ئەدەبی و هونەری و..... کە لە بڕوابون بە ئاژەڵێتی مرۆڤەوە سەریانهەڵدابو هەڵە و لاڕێ بون و شایستەی بایەخ پێدان نەبون.

هێندەش بەسبو -لەروی زانستەوە- کە گەندەڵی ئەو بناغەیە ئاشکراکەین کە ئەو هەمو رارەوەی لەسەر دامەزراوە، تاکو بیسەلمێنین کە ئەو رارەوانە -کە لەسەر بنچینەیەکی خوار و خێچ دامەزراون- نابی ساغ بن و، ناکرێ راست بن.

لەگەڵ ئەوەشدا لە گفتوگۆی ئەو راوبۆچونە خوار و لاڕێیانە بەردەوام دەبین تا ئەوە رونکەینەوە چ لاڕێبونێکی لە خودی خۆیاندا هەیە بەچاوپۆشین لە لاڕێبون و خواروخێچی بنچینەکەیانە.

کاتێك لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژو دەڵێ: مێژوی توخمی مرۆڤ بریتیە لە مێژوی گەڕان بەدوای خۆراکدا (!) یەك بەڵگە نەویستی زۆر ساکار و ئاشکرا پشتگوێ دەخا، مرۆڤ سەیری پێدێ چۆن بەو سانایە کەسێك دەتوانێ خۆی لێ گێل بکا، خۆی لەوە گێل دەکا کە هەمو مێژوی ئاژەڵیش بەهەمان شێوە مێژوی گەڕانە بەدوای خۆراك، ئەدی دەبێ بۆ مرۆڤ بوبێتە مرۆڤ و ئاژەڵیش هەر بە ئاژەڵی مابێتەوە هەر چەند لە رەسەن و مێژوشیاندا هاوبەش بن؟ بۆچی مرۆڤ سیستەم و هزر و بیروباوەڕ و ژیار و کارگەی دامەزراند، ئەگەر مێژوەکەی تەنیا بریتی بێ لە گەڕان بەدوای خۆراکدا؟ بۆچی -وەك پێشینە ئاژەڵەکانی- بۆ نمونە هەر لە چوارچێوەی راوکردن و تێکشکاندندا نەمایەوە؟

ئایا ئەم بەڵگە نەویستە سەرنج ڕاناكێشێ؟ ئایا سۆمای چاوان ناكاتەوە؟

مرۆڤ بەدوای خۆراكدا دەگەڕێ. بەڵێ ئەوە حەقیقەتە و، مێژوەكەشی بە گەڕان بەدوای خۆراكدا كاریگەر دەبێ، بەڵێ، ئەم حەقیقەتەیە، چونكە خۆراك (بەشێكە) لە ژیانی مرۆڤ و هەر بەشێكیش دەبێ كار لە سەرجەم بكا.

بەڵام مێژوەكەی بریتیبێ لە مێژوی گەڕان بەدوای خۆراك و، تیۆر و زانست لەسەر ئەمە دامەزرێن و، زانا و فەیلەسوف و هزرڤانی تێدا ببنە پسپۆر، ئەم یەكێكە لە سەیر و سەمەرەكانی جاهیلیەتی تازە كە بەناوی زانست و زانیاریەوە بەرپایە!

ئایا دەكرێ وەدیهێنراوێك بگاتە شتێك كە بۆی ئامادە نەكراوە و تواناكانی لەدەست دانیە و بۆی نالوێ؟

ئەدی ڕەفتاری ئاژەڵ جێگیر نیە هەر وەك (هیكسلی) گوتی، نە جۆراوجۆر دەبێ و نە دەگۆڕێ و نە باڵا دەبێ، چونكە ئاژەڵ بۆ زیاتر لەوەی تێیدایە ئامادە نەكراوە؟

ئایا گەیشتنی مرۆڤ بە دامەزراندنی سیستەم و هزر و بیروباوەڕ و ژیار بەڵگەی ئەوە نین كە بۆ هەمو ئەو ژیانە ئامادەیە و توانای پێدا دەشكێ؟ ئایا بەڵگەی ئەوە نیە كە هەر لە دروستبونیەوە ئەو وزەیە هەڵدەگرێ كە هزر و سیستەم و بیروباوەڕی لێ دەڕوێ و، هەر لە دروستبونیەوە —بە سروشتی لێكسوانی لەگەڵ گەردونی دەوروبەری خۆیدا- یەكەمین تۆرەمەی ئەو هەمو (مەعنەویات)و ڕواوە، وەك درەختێكی ڕەسەن كە لە ناخی قەوارەكەی و لە سروشتی ئامادەییەكەی هەڵقوڵاوە؟ ئایا -لەپاش ئەمە- بەڵگە نیە بۆ ئەوەی كە -تەنانەت كاتێك بەدوای خۆراكیشدا دەگەڕێ- كە گەڕانێكی بەردەوامە و تا ئێستا و تا سبەینێش بەردەوامە- تەنیا بە گەڕان بەدوای خۆراكدا خەریك نەبوە، چونكە لایەنی دیكەشی لە دەروندا هەن كە

ئەوانیش بەدوای خۆراکی خۆیـــاندا دەگـەڕێن، -تەنانـەت کـە بـەدوای خۆراکیـش دەگەڕا- وەکو ئاژەڵ تەنیا بەگەدەکەی بەدوایدا نەدەگــەڕا و، تـەنیا بەگـەدە و بـە عەقڵیشی نەبو، بەڵکو بەلایەنی دیکــەی (بـالاٌتر) بـو، جـا ئەوانـە —بـۆ نمونـە- رێنماییانکرد تا خواردن بکولێنی و ئامادەی کا و، پاشان بەکەشخەیی بیخوا و بـە کەشخەیی پێشکەشی بکا؟

یان ئێمە هەڵەین؟!

کاتێك (فرۆیــد)یـش دەڵـێ مێـژوی مرۆڤایـەتی بریتیـە لـە مێـژوی هـاندەرە سێکسیەکانی، ئینجا هاندەرە سێکسیەکانیشی هەمو لە هاندەرەکانی ئاژەڵدا کــۆ کردەوە، ئەوا بەڵگە نەویستێکی زۆر ساکار و ئاشکرای پشتگوێ خســتوە، مـرۆڤ پێی سەیرە چۆن بەو ساناییە کەسێك دەتوانێ خۆی لـێ گێل بکا، خۆی لەوە گێــل کرد کە رەفتاری سێکسی مرۆڤ بەسروشت لە رەفتاری ئاژەڵ جیاوازە.

گریمان بەشــێوەیەکی رەهـا دان بـەو ئەفسـانە ناشـیرینە دابنێـین کـە (فرۆیـد) دایهێناوە بۆ ئەوەی مێژوی مرۆڤایەتی پــێ لێکبداتــەوە، مێـژوی بیروباوەڕەکـانی مرۆڤ و، هزرەکانی و، سیستەمەکانی و، ژیارەکەی.. گریمـــان بـەرەهایی دان بـەو ئەفسانەیە دابنێین کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیـــە، ئـەوا هـەر خـۆی مرۆڤایـەتی مرۆڤ بەرجەستە دەکات!!

کوڕەکان بە ئارەزوی سێکسەوە رویان کردە دایکیان و دیتیان باوکیان تەگەرەیە لە پێشیان.. جا کوشتیان.

پاشان لە کردەوەکەیان پەشیمان بونەوە.

سوێندیان خوارد یادی پیرۆزکەن.. جا پەرستن سەریهەڵدا.

دیتیان وا لەناو خۆیان یەکتر دەکوژن تا دایکەکەیان دەسکەوێ..

جا بڕیاریاندا کەسیان دەستی لێنەدەن.. بۆیە (حەرام) سەریهەڵدا.

بڕیاریاندا لەنێو خۆیاندا هاوکاری بکەن لەباتی شەڕکردن و یەکتر کوشتن، جا هاوکاری بە کۆمەڵ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا سەریهەڵدا.

بەڵێ.. -بەشێوەیەکی کاتی- بەم داستانە رازی دەبین.

بزانین چی تێدایە؟

لە سەرەتادا ئەوەی تێدایە: کە ئەوا لە کردەوەکەی خۆیان پەشیمان بونەوە.

کەواتە لەناخی قەوارەی مرۆڤدا، لە تاریکیەکانی سەرەتای، بەر لە بەرەبەیانی مێژو، بەهای ئەخلاقی بۆ کردەوەکان بە پاڵنەری پاڵاوتەی غەریزەکان هەبون.

ئاژەڵ لە کردەوەی خۆی پەشیمان نابێتەوە، هەڵسەنگاندنێکی رەوشتی بۆ کردەوەکانی نیە. هەستێکی نیە پێی بڵێ -بێجگە لە پەرچەکردار[1]، کە تەواو هەستیە- ئەم کارە هەڵەیە یان ئەوێهێ کارێکی ڕاستە.

بەڵام ئەو کوڕانە -هەروەك (فرۆید) دەڵێ- لە کردەوەی خۆیان پەشیمان بون، کەواتە لە قەوارەی ئەواندا هەستێك هەیە بەهایەکی رەوشتی بداتە کردەوە و، لێناگەڕێ هاندەری غەریزە حوکمی بەسەر بکات.

رەنگە غەریزەش بەرەڵلا بێ و بەسەر (هەستی رەوشت)دا زاڵبێ و بێدەنگی بکا. بەڵێ ئەوە ڕودەدا، بەڵام مانای وانیە کە هەستی رەوشتی وجودی نیە، یان لە دەرەوەی خۆی بەسەر مرۆڤدا فەرزکراوە بەبێئەوەی هیچ مایەیەکی[2] لە ناوەوەدا

---

[1] پەرچەکردار: الفعل المنعکس.. لە پەرچەکرداردا ژانی بەرهەست یا چێژی بەرهەست کردەوەیەکی دیاریکراوە و پەیوەستە، جا ئاژەڵ وەك ئەنجامی ئەو پەیوەستەیە رو یا پشت لە کردەوەکە دەکات، هەروەك سەگ نایەتە ژورەکەت چونکە تۆ لەوێ لێتداوە و ئازارت داوە و، کاتێکیش دەیلاوێنیەوە روت تێدەکا و یاریت لەگەڵ دەکا.

[2] مایە: رصید.

هەبێ..

نەخێر! چونکە ئەم هەستە رەوشـتیە بەشێکی رەسـەنە لـە قـەوارەی مـرۆڤ. ئامادەییەکی فریشـکیە، لـە دەرەوەرا گەشـەی پێدەکـرێ، یـان لـە دەرەوەرا لاواز دەکرێ. بەڵام هەردەم لە قولایی فریشك دا هەیە ئەگەر حەیوانەکانیش پێی قـەڵس بن.

دوەم لەشت ئەفسانەکەدا ئەوەیە: کە کورەکان بریاریاندا یەکێك لـەو چالاکیانـە لە خۆیان (حەرام) بکەن کە -وەك (فرۆید) هەڵیبەستاوە- هاندەرە غەریزییـەکانیان بۆ ئەنجام دانیان پاڵیان دەنێ..

هاندەری ئەو حەرامکردنەش هەرچی بێ ئەمە کردارێکـی تـەواو مرۆڤانەیـە و رەفتاری ئاژەڵانەی تێدا نیە. چونکە کۆمەڵگەی مانگا کـە (داروین) باسـیکردوە هەرگیز شتێکی لەم بار و بابەتەی لەخۆی حەرام نەکردوە و، پـەندی لـەو ملیۆنـان ملیۆنەی باپیرانی وەرنەگرتوە کە لە کاتی شەر لەسـەر دایکـدا کـوژراون و، برینـە واقیع و بەرچاوەکانیش رێی ئەوەیان لێنەگرتوە کە لە شەرەکەی بەردەوام بـێ تـاکو لە کۆتایی سەرکەوتن یان لەنێوچونی دەردەکەوێ.

کەواتە مرۆڤ لە توانایدا هەیە کە -بە هـەڵبژاردنی خـۆی و، لـەپێناو سـودی کۆتایی خۆی کە نە بەرچاو بێ نـە بەرهەسـت- جۆرانێـك لـە چـالاکی غـەریزەیی لەخۆی حەرام بکا کە ئاژەڵ ناتوانێ حەرامیان بکاو. ئەمەش وا دەخـوازێ کـە لـە قەوارەی مرۆڤدا توانای رێکخسـتن(ضبط) یـا -هێکسـلی واتـەنی- لـەناوبردن و خەفەکردن هەبێ کە بریتیە -هەروەك دیسان هێکسلی دەڵێ- لە توانایەکی نـاوازە بێجگە لە مرۆڤ هیچ شتێك نیەتی.

سێیەمیش ئەوەی تێدایە: کە کورەکان بریاریاندا لەباتی شـەر و لێکـتر کوشـتن هاوکاری یەکتری بکەن و، ئەمەش پێویستی بە شیکردنەوە و لەسەر رۆیشتن نیە.

ئێمه -چیدیكه- بڕوامان به ئەفسانەكەی (فرۆید) نیه و، ئامرازیشمان بۆ سەلماندنی مرۆڤایەتی مرۆڤ ئەوه نیه كه بەڵگه له ئەفسانەكان بخوازین هەروەك زانا تۆژەرەوەكان دەیكەن! چونكه مێژوی واقیعی مرۆڤ لەسەر زەویدا پڕیەتی له بەڵگەی مرۆڤ بونی. بەڵكو تەنیا ویستمان بڵێین تەنانەت ئەم ئەفسانه ناشیرینەش كه پیسترین وێنەی بۆ مرۆڤایەتی تێدا ڕەنگ دەداتەوه، له دوتوێی خۆیدا بەڵگەی مرۆڤایەتی مرۆڤی هەڵگرتوه!

حەزدەكەین لێرەدا جەخت لەسەر حەقیقەتێك بكەین كه پێویستمان به جەخت لێكردن نەبو، ئەگەر ئەومشتومڕە دور و درێژ و پانوپۆرە له ئەوروپا له ئارادا نەبا لەنێوان تیۆرە ڕكابەرەكان، كه گەیشته ڕادەی توندڕەویەكی عەیبدار لەنێوان لایەنەكاندا، هەر یەك لایەنێكی دۆزەكەی دەگرت و تا دوا ڕادە ڕایدەكێشا.

ئێمه كاتێك مرۆڤایەتی دوپاتدەكەینەوه ئەمه ئەوه ناگەیەنێ كه ئێمه نكوڵی له لایەنه ئاژەڵانەكەی دەكەین.

نەخێر! چونكه بێگومان لایەنی ئاژەڵانه له مرۆڤدا هەیه و، حەقیقەته.

بەڵام لایەنی مرۆڤانەش بەهەمان شێوە هەیه و، تەنیا له عەقل و نەفس و روحی مرۆڤیش ڕەنگ ناداتەوه، كه ئەو لایەنانەن مرۆڤ تێیاندا تاكه و بەمان له ئاژەڵ جیا دەبێتەوه، بەڵكو لەوەشدا ڕەنگ دەداتەوه كه مرۆڤ پێداویستیه ئاژەڵیەكانی به شێوازی مرۆڤ ئەنجام دەدا نەك به شێوازی ئاژەڵ.

دەخوا و دەخواتەوه و، دەپۆشێ و نیشتەجێ دەبی و، حاجەتی جێبەجێ دەكا و وەڵامی هاندەرەكانی سێكسی دەداتەوه.. هەموی بەشێوازی مرۆڤ، ئەو شێوازەی كه ئەنجامدانەكه (مشتومالْ) دەكا و بەهەندێك ڕێوشوێنی دیاریكراودا دەبا كه ڕەقەكاریەكه نەرم دەكا و واتای زەرورەتی تێدا كەم دەكاتەوە و، دەیكاتە ڕەفتارێك و ڕێوشوێنێك بەرزبونەوە و (هەڵبژاردن)ی تێدا بێ.

(مرۆڤ) ئاوا دەکا. لەمانەشدا مرۆڤێك لە مرۆڤێـــك و نەوەیـەك لــە نەوەیـەك چاکتر دەبێ، هەتاکو هەستەکان زاخاو بدرێن و رەفتارەکان پاك بن و، لــە زەرورەت دەرچن و ببن بە رەفتارێکی رێکوپێك کە (نەفس) هەڵیبژێرێ، مرۆڤ (باڵاتر) دەبــێ و پتر لە ئاژەڵایەتی دووردەکەوێتەوە. تا مرۆڤیـــش بـۆ جیـهانی زەرورەت دابـەزێ، بەهەمو رەقەکاریەکانی و، بە هەمو دڕندەییەکان و، کە وای لێبێ رەفتـــاری خـۆی (هەڵنـەبژێرێ) بـۆ ئـەنجامدانیان بـەڵکو بـەهاندانی راسـتەوخۆی غــەریزە و هــەر بەشێوازی غەریزەش تێریان بکا، پتر بە ئاژەڵەوە دەنوسێ و بەزەویـــەوە دەلکـێ و، بەرەو دوا دەگەڕێتەوە و، بەرەو وەحشیەت و کێویاتی و دواکەوتن و تاریکی..

هەستکردنی مرۆڤ بەخۆی و تێڕوانینی بۆ رەفتاری هەروا مایەوە، هەتا لەسەر دەستی (داروین) و (فرۆید) رێنوێن بو کــە نابــێ و دروســت نیــە وا بکــا، چونکــە ئاژەڵە!

***

هەرچی ماددیەتی مرۆڤە، بەواتای گرمۆڵەکردنی لە چوارچێوەی هەســتەکانی و دەوروبەری ماددی، ئەوا -بەڕای هێکسلی- ئەنجامێکی لۆجیکی تیۆری (داروــن) بو لە بابەت ئاژەڵێتی مرۆڤ، چونکە ئاژەڵ بە قـــاوغی هەســتەکانی سـنوردارە و، پاشان مرۆڤ -کــە وەکــو ئــاژەڵ وایــە- بەهەمانشـێوە بــە دەوروبــەری مـــاددی و ئەوشتانەی هەستەکان پەی پێ دەبەن سنوردار کراوە.

لەمەشــدا لێدەگــەڕێن -دووکــەس- لــە خانــەوادەی هێکســلی وەرامــی ئـــەم هەڵبەستە ناڕەوایە بدەنەوە، هەر چەندە هەردوکیان بێبــاوەڕیش بــن و نــەتوانن دان بەوە دابنێن کە مرۆڤ توانای هەبێت پەیوەندی بە خوداوە بکات:

جۆلیان هێکســـلی دەڵــێ: ((هــەندێ تاقیکردنــەوە وەك ئەوانــەی (بــین تــیریل) دەربارەی هەڵهێنان(حدس) بەبێ بەکارهێنانی هەستەکان ئــەنجامیداوە و، ئەوانــەی

(گلیبەرت فرای) لە گواستنەوەی بیرەكان(الافكار) ئەنجامیداوە، هەروەها ناوبـەناو نوسینی زۆریش لەبارەی خوێندنەوەی بیر و پێشبینی داهاتو، تـا وا بگەیـەنن كـە هەندێ كەس توانای زانینیان هەیە بەرێگەی دیكە جگـە لەرێگـەی ئاسـایی پـەی پێبردن بەهۆی هەستەكانەوە)).

هەروەها (ئەلدۆس هێكسلی) كە بۆخۆی بێباوەڕە هەرچەند كەمێك لە جۆلیانی برای باشترە، دەڵێ: ((هیچ دەرفەتمان نەماوە، دەبێ دان بەوە دابنێین كە خـەڵكانێك هەن توانای لێڕوانین(استشفاف)ی نادیاریان هەیە بەرێگەیەكی بەدەر لە چوارچێوەی هەستەكان، ئەگەر چی رێگەی ئەو لێوەڕوانینەش نەزانین بەڵام ئەمە نابێتە بیانو تا نكوڵی لـێ بكەین، چونكە هەر هێندەی ناشـارەزاییمان بـەو چۆنیەتیـەی كـرداری پەی پێبردن و كرداری بیركەوتنەی پێ ئەنجامدەدرێ، بەوەش ناشـارەزاین. كـێ لـە ئێمـە دەتوانـێ بزانـێ موعجـیزەی پـەی پـێ بـردن و یـا بیركەوتنـەوە چیـە؟ بەهەمانشـێوەش نـازانین ئـەو لێڕوانینـە چۆن رودەدا، بـەڵام سـەرەڕای ئەمـەش حەقیقەتێكی زانستیە).. ئەوجا لە كۆتایی قسـەكانیدا قسـەیەكی (دكتـۆر رایـن) دێنێتەوە كە یەكێكە لەو زانایانەی بـەم توێژینەوانـە خـەریكن كـە گوتویـە: ئـەم حەقیقەتانە وردە وردە دەمانبەنە نێو جیهانی ئاین.

ئێمە بۆیە ئەو قسانە ناگوێزینەوە هەتا بەڵگـەی فراوانـی چوارچێـوەی مرۆڤـی لێوەرگرین كە لەنێو دەوروبەری مادە و دەوروبـەری هەسـتەكاندا گرمۆڵـە نـەبوە، نەخێر، ئێمە لەوەدا پێویستمان بە شـایەدیدانی (زانسـتی ئەزمونگـەری)[1] نیـە و، بەڵگە ئاشكراكانی ژیانی مرۆڤایەتیش پێویستیان بە رونكردنەوە نیە، بەڵكو تەنها بۆیە دەیانهێنینەوە تا بڵێین: تەنانەت زانستی ماددی بێـبڕواش نـەیتوانیوە مـرۆڤ

---

[1] زانستی ئەزمونگەری: العلم التجریبي.

لەلای ئەم سنورە تەسکانە رابگرێ کە (داروینیزم)ی کۆن پتر لـە سـەدەیەك تیـایدا گرمۆلەی کرد.

مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ پاش تێپەڕبونی ئەو ماوە دور و درێژە لەو جاهیلیەتە تاریکەی بەناوی زانست لە ئارادا بو، چۆن مرۆڤ توانی بەمشێوەیە سەرەوژێر بـێ، جا پشت لە خۆی و لــە وزە و تواناکـانی بکـات و، بـە سـەقەتی و گـەمارۆدراوی دانیشێ لەگەڵ ئەوەی توانای هەڵفڕین و رەهابونی هەیە! چۆن ئامرازەکانی زانیاری لەخۆی گاڵە دەدا و تەنیا یەك ئامراز دێڵێتەوە، کە ئەمەش هەر چەند فـراوان بـێ هەر تەسك و تریسکە و، هەر چەند گشتگیر بێ هێشـتا هـەر بەشـەکیە[1] و، هـەر چەندی قوڵ رۆچوبێ هێشتا هــەر تـەنیا پـەی بـە روکەشـی شـتەکان دەبـا، چـۆن پەیوەندی خۆی لەگەڵ هێزی هەرە مەزن دەپچڕێنێ و دادەبڕێ، هەروەك کرم و مێرو لەو شتەکان دادەبڕێن، لە کاتێکدا دەتوانێ -بەهۆی پەیوەندی بەو هێزەوە- ژیـانی خۆی فراوان بکا و دەرونی خۆی فراوان بکا و پەیوەندیـەکانی بـە گـەردون و ژیـان فراوان بکا و.. لەگەڵ برای مرۆڤیدا لە فراوانترین چوارچێوەی هەسـتی و کرداریـدا بژیێ.. لەسەر پەیوەندی خۆشەویسـتی ئـاڵوگۆرکراو، پـەیوەندی بیروبـاوەڕبون بـە خودا.

چۆن.. تەنیا دەبێ سەروژێر بونێك بـێ بـۆ جیـهانی ئـاژەڵ، سـەرەو ژێربونێـك (زانست) فوی تێ دەکا و شەیتان پیرۆزی دەکا.

مرۆڤ بونەوەرێکی گەورە و مەزنە و، موعجیزەیە و، گـەورەترین موعجـیزەش تیایدا ئەو تێکەڵە سەیرەیە لە قوڕی زەوی و فوی باڵای خودا لە رۆحیدا: (مشـتێك لە قوڕی زەوی کە رەگەزە ماددیەکانی زەوی تێدا ڕەنگ دەداتەوە لە ئاسن و مـس

[1] بەشەکی: جزئي.

و کالیسیۆم و فسفۆر و ئۆکسجین و هایدرۆجین و، ئارەزوەکانی زەوی و هاندەرەکانی زەوی تێدا ڕەنگ دەداتەوە و، فویەك لە روحی خودا کە گیانی رۆن و توانای بەرز و بالآبونی تێدا ڕەنگ دەداتەوە، هەروەك ویستی ڕێکخەر و توانای هەڵبژاردنی تێـدا ڕەنگ دەداتەوە[1]، چ گێلاتیەکە مرۆڤ ئەنجامی دەدا کاتێك ئەو دو ڕەگەزەی خـۆی لێك جودا دەکاتەوە - کە لە تێکەڵبونەکەیان موعجیزەی توانـــای خـودای خـاوەن توانای تێدا ڕەنگ دەداتەوە- ئـەوجا یـەکێکیان لـە دوری خـۆی تـوڕ هـەڵدەدا و بەتەنیا لایەنێکی وازدێنێ و، لە کـاتێکدا هـەموی هەیـە؟ مرۆڤیـش —کـە بـەم شێوەیە تواناکانی خۆی تێکدەشکێنێ و، بەرەو توانەوەی دەبا- لە هـەمانکات لـە هەمو فریشکی ژیان وەدور دەکەوێ، لە کاتێکدا کە ئارەقەی لێدەتکـێ بـۆ گـەڕان بەدوای دیاردەکانی ژیان!

فریشکی قوڵی ژیان لە هەمو زیندەوەراندا -بە مرۆڤیشەوە- بە بەجێگـەیاندنی زەرورەت لە نێزیکترین ڕێگەوە واز ناهێنێ -هـــەروەك (داروین) بانگەشـەی کـرد کاتێك جەستەی (زیندەوەران)ی دیراسە دەکرد- بەڵکو هەردەم هەوڵی چـاککردنی (بەجێگەیاندن) دەکا لە هەمان ئەو کاتەی کـە (دروسـتی) بەجێگـەیاندن دەکاتـە ئامانج، واتە تەنیا بە زەرورەت وازناهێنێ بەڵکو جوانیش دەکاتە ئامانج.

((ئەو گوڵە جوان و بۆنخۆشە دەبینی ڕەنگەکانی چەند ڕێك و گونجاون؟

ئایا پێتوایە ئەمە زەرورەتە؟

((گوتیان: بۆ ئەوەیە تا هەنگ بۆ خۆی ڕاکێشێ و هەنگوینی لـێ بەرهەم بێنێ کە خۆراك و چارەسەرە بۆ خەڵکی و، یارمەتی ماککوتانی روەکیش دەدا.

---

[1] لە کتێبی (قبسات من الرسول).

ئایا گومان دەبەی؟ ئایا بەگوێرەی هەنگ زەرورەتە کە گوڵ ئەو هەمو جوانیەی تێدابێ؟

((نەخێر بەخوا، چونکە هەنگ وەدیهێنراوێکی ساکارە و، لەسەر جوانترین گـوڵ و گوڵێکی ئاساییش هەڵدەنیشێ.

((کەواتە جوانی گوڵەکە پێداویستی نیە و، هـــەمو ئامانجـە (بـایۆلۆجی)ەکـان دەکرێ لە ساکارترین گوڵ بێنەدی هەروەك لە جوانترین گوڵ دێنەدی.

((ئەدی ئەم (سروشت)ەت دیوە؟

((سورایی هەرە جوانی کازیوە و جوانی تازە بەیانت بینیوە؟

((جوانی بێوێنەی چیاکانت دیوە کە پشی رادەگرێ و ویژدان دەهەژێنێ؟

((لەگەڵ دەریای بێکۆتا راکشاو کە شـەپۆلان دەدا، بەشـەو دەبینـی وەك بلێـی پرشنگ یا.. مێردەزمە دایانپۆشیوە؟

((ئەدی مانگە شەو.. ئایا (تام)یت کردوە و؟ (تام)ی سیحری ترێفەکەیت کردوە و، لە سێبەرەکەی و، پرشنگە بڵاو و چرپەکانی چێژت وەرگرتوە؟

((ئایا پێتوایە ئەمە زەرورەتە؟

((زەرورەتی هەمو ئەمانە لە کوێن، کە ژیان بەبێ ئەم جوانیەش بەرێوە دەچی؟

((ئەدی ئەو روە جوانەت دیوە؟

((ئەو جوتە چاوە خومارەی جیهانێکی قوڵیـان تێـدا دیـارە... ئـەو رەنگـورِوە رێکوپێك و، ئەو واتا پر دەربرِینە.. ئەو (گیانەی) لە پشت رەنگوروەکە دیارە؟

((پێتوایە ئەمە زەرورەتە؟ جا زەرورەت چیە؟

((ئایا کـرداره (بـایۆلۆجی)ەکـان لـە خـواردن و خواردنـەوە و هەناسـەدان لـە ناشیرینترین رو و جوانترین رو هەروەکو یەك نایەنە ئەنجام؟

((بەڵکو.. تەنانەت ئارەزوی سێکسیش، ئایا لـە هـەمو مـێ و هـەمو نـێرێك وەدی نایێ بەچاوپۆشین لەو جوانیە؟

((نەخێر، ئەوە (زەرورەت) نیە، بەڵکو ئەمە (جوانی)ە.

((ئەمە چاك جێبەجێکردنە نەك تەنیا جێبەجێکردن.

((ئەمە فریشکی ژیانە وەك خودا وەدیهێناوە.. فریشکی سروشت))[١]

ئەوە ئەو فریشکەیە کە مرۆڤ لەبیری چـوە و بـەدوای رواڵەتـە بەرهەسـتەکانی شتەکانیشدا دەگـەڕێ و، لەگـەڵیدا خۆشـی لـەبیر چـوە و، بـۆ جیـهانی زەرورەت دابەزیوە، هەر بە ئەنجامگەیاندنی زەرورەتەکانی بەنێزیکترین رێگە وازدێنێ، چـاك ئەنجامدان ناکاتە ئامانج. ئەو چاکیەی واتای پاککردنەوە و بەرزبونەوە هەڵدەگرێ.

سەریریش نیە، کاتێك مرۆڤ لەخودا لاڕێ دەبێ، بەهەمانشێوە لـە فریشـکیش لاڕێ دەبێ، پەنا بەخوا لەتاریکیدا بەرەو ژێر دادەکشێ هەتا نێو قوڕە شینێ!

***

ئەوە دۆزی ئاژەڵێتی بو کە تیۆری (داروین)ی لێوە هەڵقولاَ و، ئـەوەش ئاسـتی حەق و بڕی گومڕایی بو تیایدا..

هـەرچی دۆزی دوەمـە کـە لـە هـەمان تیـۆر سـەریهەڵداوە بریتیـە لـە دۆزی گەشەسەندنی بەردەوام کە رەگەزی جێگیری نایەڵێ.

---

١ لە کتێبی (قبسات من الرسول) بەشی (ولیرح ذبیحتە).

لە کۆتایی سەدەی حەڤدە و سەرەتای هەژدەدا بیرۆکەی گەشەسەندن لــە هــزری ئەورووپیدا شتێکی تازە بو، (ئاسودەیی/ترف)ێکی عەقڵی بو زانایان لەنێو خۆیــاندا گفتوگۆیان دەکرد و کتێبیان دەربارە دادەنا، بەڵام نەبوە بیرۆکەیەکی میللی و وێنە توندوتیژەکەی وەرنەگرت، هەتا ئەو کاتەی تیــۆری (داروین) هاتــە ئــارا، چونکــە پاڵپشتی زانستی لەو تیۆرەدا دۆزیەوە کە پێشتر پێویستی بو، پاڵپشتێك لە نــاخی فریشکی ژیان، پاشانیش بەڕاستی بیرکردنەوەی زانایانی داگیر کــرد و، لــەوێوە بــۆ بیری جەماوەر گوێزرایەوە، هەمو وەکو پــەتا گرتیانــەوە و، هــەمو شــتێکی ســەر زەویان پێ ڕاڤە کردن، -لەبەر توندی پەتاکەش- وایان بەخەیاڵدا دەهات کــە ژیــان بێ بنەمایە و، گەردونیش هەموی بێ دەستورە!

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بیرکردنەوەی ئاینیش بەتایبەت پێــی لەســەر بیرۆکــەی جێگیری داگرتبو تاکو کردیە بیروباوەڕ کاتێك پیاوانی ئاین وایان گومــان بــرد کــە جێگیری وەدیهێنەر -پاکی بۆ وی- و جێگیری مەبەستی لــە وەدیــهێناندا، واتــای جێگیری هەمو شتێك لە وەدیهێنراوەکانی دەگەیەنێ و، مانای جێگیری مرۆڤ بــە سیستەم و داب و نەریتەکانی و ، هەمو ئەو شتانەی لــە دەوروبــەریدا بەژیانیــەوە پەیوەستن.

ئەوەی بەم گومانەش فریوی دان -هەروەك لەبەشی پێشتر باسمانکرد- ئەو شــتە باوانە بو لە زانستی ئەو ســەردەم دەربــارەی بیرۆکــەی جێگــیری.. بۆیــە بیرۆکــەی گەشەسەندن -پاش سەلماندنی لەلایەن زانستەوە- نسکۆیەك بو هاوسەنگیەکەی لــە دەستدان بۆیە خۆیان بە هەمو دۆڵێکــدا دەدا و (ويحســبون أنــهم مــهتدون: وایــان دەزانی کە ڕێنوێن بون!)!

ئەوەش لە سەدەی نۆزدەمین!

لە کاتێکدا زاناکانی موسڵمانان دە سەدە پێشتر بەرونی جێگیری وەدیهێنــەر -

پاكی بۆ وی-یان لە گەشەسەندنی وەدیهێنراوەكانی جودا كردبۆوە..

(دریبەر)ی ئەمریكی لە كتێبی (كێشەی نێوان زانست و ئاین)دا دەڵێ:

((ئێمە سەراسیمە دەبین كە لە دانراوەكانیان هەندێك بۆچونی زانستی دەبینین كە لە ئەنجامەكانی زانستی ئەم سەردەمەی تێدەگەیشتین و ، لەوانەش ڕارەوی دروستبون و بەرزبونەوەی بونەوەرە ئۆرگانیەكانە كە بە رارەوێكی تازە دادەنرێ، پێشتر لە قوتابخانەكانی ئەواندا دەخوێنرا و، گەلێك لە ئێمە پتر تێیدا قوڵ ببونەوە، ئەمەش چونكە لەسەر بێگیان و كانزاكانیش پیادەیان دەكرد)).

هەروەها موسڵمانان بەئاشكرایی هەستیان بە گەشەسەندنی ژیانی مرۆڤایەتی دەكرد، ئیبن خەلدون لە پێشەكیەكەیدا -كە بۆ خۆی لە راستیدا یەكەم زانای كۆمەڵناسیە، بەواتای زانستی نوێ- وەسفی گەشەسەندنی كۆمەڵگەكانی كردوە لەگەڵ فاكتەرە جیاوازەكانی كاریگەریان لەسەر ئەو گەشەسەندنە هەیە، هەروەك خودی فیقهی ئیسلامیش پیادەكردنێكی كرداری بیرۆكەی گەشەسەندنی مرۆڤە. چونكە ئەركەكەی بریتیە لە گەڕانی بەردەوام بەدوای چارەسەری نوێی وەرگیراو لە بنەما و رۆحی ئاین، بۆ روبەڕوبونەوەی گیروگرفت و پێویستیەكانی مرۆڤ. یا هەروەكو عومەری كوڕی عەبدولعەزیز دەڵێ: (چەند دۆز بۆ خەڵكی دەدۆزێتەوە هێندەش قەزاوەتیان بۆ دابین دەكا)).

ئەگەر پیاوانی ئاینی لە ئەوروپا و لە سەدەی حەڤدە و سەدەی هەژدەدا ئەو تێگەیشتنە پێگەیشتوەیان هەبوایە كە موسڵمانانی سەدەی یەكەمی كۆچی (حەفتەمی زاینی) هەیانبو، توێژینەوە زانستیە نوێیەكان توشی نسكۆی نەدەكردن و دژایەتی لە نێوان ئەوان و زانستدا بەرپا نەدەبو، ئەو دژایەتیەی لە كۆتاییدا ئەوروپای گەیاندە هەڵدێر.

***

ژیانی مرۆڤ گەشە دەکا. بەڵێ. هەمو گەردونیش گەشــە دەکـا.. ئایـا ئەمــە وادەگەیەنێ کە هیچ بنەمایەکی جێگیر لەم گەردونە و لە ژیانی مرۆڤدا نیە؟

سەدیمەکان گەشە دەکەن و دەبنە ئەستێرە.. ئەستێرەکانیش کە دەسوڕێن گەشــە دەکەن، گەرم دەبن و سارد دەبنەوە و، دەقوڕپێن و خێرا دەبــن و هێـدی دەبنــەوە.. بەڵام هیچ شتێك لەمانە بەبێ یاسا رونـادا و، هیـچ شـتێك لەمانــە لــە دەسـتور دەرناچێ، ئەو دەستورەی کە زانست ئەگەر مادده و ئـامرازی بـۆ هەڵکـەوێ هـەر جارەی لایەنێکی دەردەخا.

مرۆڤیش گەشە دەکا.. رۆژبەرۆژ ژیانی دەگۆڕێ و، هـــەر رۆژەی شـتێکی تـازە دادەهێنێ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ملکەچی دەستورەکانە. هەمان ئەو دەســتورانەی حوکمی بونەوەر و حوکمی ژیان دەکەن.

گەردون گەشە دەکا.. بەڵام ئایا سروشتەکەی گەشە دەکا؟ ئایا ئەوە دەگۆڕێ کە لە وزەیەك یا کۆمەڵە وزەیەك پێکهاتوە؟

نەخێر! هیچ یەکێك لە زانایان واینەگوتوە. بەڵکو وێنە و حاڵەتەکانی دەگۆڕێــن و جەوهەرەکەی وەك خۆی چەسپاو و جێگیرە.

هەروەها مرۆڤیش گەشە دەکا.. بەڵام ئایا سروشت دەگۆڕێ؟

یـاخود وێنــە و حاڵەتــەکانی دەگـۆڕێ و ئــەو جەوهــەرەی تێیدایــە نــەگۆڕاو و جێگیرە؟

ئەوەی بــەدرێژایی ماوەیــەکی دور و درێـژ و هــەڵگێڕ و وەرگـێڕێکی بـەردەوام لەنێوان سەدان بارودۆخدا لە قەوارەی مرۆڤدا گۆڕاوە چیە؟

شۆڕشی پیشەسازی گۆڕانکاری گەورەی لە بەڕێوەچونی کۆمەڵگــەی ئـەوروپیدا دروستکرد، گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی و هزری و رەوشــتی.. جـا

لەسەرەتادا لەبەر ئەو گۆڕانکاریە خێرا و یەکبەدوای یەکە خەڵك وایانزانی هــەرچی ڕودەدا تەواو نوێیە و، پێشتر هاوشـێوەی نـەبوە و، ئـەوجا ئـەو خەیاڵـە مێشـکی داگرتن وایانزانی: کە ئەوان وەدیهێنراوێکی تازەن هیچ پـەیوەندی و پێکچونێکیـان لە نێواندا نیە لەگـەڵ وەدیـهێنراوانی پێشـو، کەواتــە هێڵـی بـەردەوام لــە ژیـانی مرۆڤایەتیدا نیە و، قەوارەیەکی جێگیریش نیە ناوی مرۆڤ بێ.

ئەگەر عاقلتر و لەســەرخۆتر بوانـا، یـان بەبیرۆکـەی گەشەسـەندن ئاشـنابان - هەروەك لە هزری ئیسلامیدا هەبو- بەو دەردە نــەدەچون و نەدەکەوتنــە نێــو ئــەو ئەندێشە ترسناکە.

ئەوەی لە قەوارەی مرۆڤدا گـۆڕا چ بـو لـەنێو ئـەو شـەپۆلە زەبەلاحانـەی کـە شۆڕشی پیشەسازی دروستی کرد؟

ئایا گەڕانی بەدوای خۆراك یا بەدوای سێکس یـا گـەڕان بـەدوای ئاسـایش یـا گەڕانی بەدوای دەرکەوتن و جودایی گۆڕا؟

ئایا پێکهاتـەی دەرونـی گـۆڕا لـە هـاندەرە پـڕ جۆشـەکانی فریشـك و هـێزی ڕێکخەری هۆشیار یا بێهۆش، بەهێز یا بێهێز، کارا یان بێکار؟

ئایا خولیای مانــەوە و؟ خولیـای بـەردەوامبون و؟ خولیـای زانـین و؟ خولیـای جاویدانی[1] گۆڕاوە؟

ئایا هەرگیز ئەمە دەگۆڕێ؟.. یا وێنە و حاڵەتەکان دەگۆڕێـن و، جەوهەرەکـەی وەك خۆی نەگۆڕ و جێگیرە.

دروست نیە و جۆراوجۆری داخـوازی و جۆراوجـۆری بـارودۆخ هەڵمانخەڵـەتێنی. چونکە وێنە و شێوەکان لە واقیعدا جۆراوجۆر بون. بــەڵام ئـارەزوە سـەرەکیەکان و

١ جاویدانی: نەمری: خلود.

ترسە سەرەکیەکان نەگۆڕاون، ئەمەش بریتیە لەو (قەوارە)یەی کــە پێــی دەگوتــرێ مرۆڤ.

مرۆڤ ئارەزوی خۆراك دەکا، جا نێچیرێکی خاو بخوا، یان گیایەکی زەوی، یــان بەساکاری بیکولێنێ و بەدەست بیخوا، یا لەســەر مــێزێکی رازاوە بــە چــەنگاڵ و ملاك و چەقۆ بەکەشخەیی و رێکی و هێمنی بیخوا.

چی گۆڕاوە؟ چۆنیەتی ئەنجامدان یا ئارەزوی شاراوەی ئاو و خۆراك؟

هەروەها مرۆڤ ئارەزوی سێکس دەکا، جا وەکو ئاژەڵ لە دارستان ئەنجامی بدا. یا بەساکاری و خێرایی ئەنجامی بدا. یان بــە کەشــخەیی و غــەزەل و هونــەرکاری. بەدزی و دەستدرێژی لە تاریکی هەستەکاندا ئەنجامی بــدا. یــان لــە ئاراســتەیەکی دەرونی لە سایەی شەریعەت و یاسایەك ئــەنجامی بــدا.. چــی گــۆڕاوە؟ چۆنیــەتی ئەنجامدانی یا ئارەزوی شاراوەی نێو سێکس؟

هەروەها مرۆڤ ئارەزوی ماڵ دەکا، جا کاتێ لە دارســتاندا کوخێــك لــە قــەدی درەختان دروست دەکا، یا لە گوندێــك کوخێــك لــە قــوڕ یــا خانویــەك لــە خشــت دروستدەکا، لە شاریشدا بالاخانەیەك دروستدەکا کــە تــازەترین ئــامراز و نوێــترین کەلوپەلی تێدابێ..

چی گۆڕاوە؟ ئایا ئارەزوی ماڵ و نیشتەجێبون گۆڕاوە یا شێوە و شێواز؟

هەروەها مرۆڤ ئارەزوی جلوبــەرگ پۆشــینی هەیــە بــۆ جوانــی و بــۆ بــەرگری ناهەمواریەکانی کەشو هەوا و لەبــەر هــۆی دیکــەش، لــە دارســتاندا پۆشــاکێکی چەرمین دروستدەکا و، لە بیاباندا پۆشاکێکی لەمو و، لە بەستەڵەکیش پۆشاکێکی خوری و، لە شاریشدا پۆشاکێکی چنراوی رەنگاو رەنگ.. چی گۆڕاوە؟

ئایا ئارەزوی جلوبەرگ پۆشین گۆڕاوە یان وێنە و شێوەکان گۆڕاون؟

هەروەها مرۆڤ ئارەزوی لە ئامرازەکانی هەسانەوەیە جارێك نوێنێك لە گـەڵای دار دروست دەکا و، جارێکیش لە توکی نەعامە و، جارێك لە پەمۆی پەڕە کراو و، جارێك لە ئیسفەنج..

چی گۆڕاوە؟ ئایا ئارەزوی هەسانەوە گۆڕاوە یان شێواز و شێوەکان گۆڕاون؟

هەروەها مرۆڤ لە مردن دەترسێ. لە دارستان لێی دەترسێ و، لـە گونـد لێـی دەترسێ و، لەشار لێی دەترسێ و، لە وشـکانی لێـی دەترسـێ و، لـە دەریـا لێـی دەترسێ و، لە ئاسمان لێی دەترسێ و. گـەلێك هەسـت و زۆر هەڵوێسـت و گـەلێك پارێزی لـێ وەردەگرێ.. چی گۆڕاوە؟ ترسی ڕەگازۆ یان ڕواڵەت و شێوەکان؟

پیاو لەگەڵ ژنەکـەی بەشـەڕ دێ.. لەگـەڵی بەشـەڕ دێ چونکـە (گـۆزە)ی بـۆ نەهێناوە تا ئاوی لـێ بخواتەوە، یا بۆیە لەگەڵی بەشەڕ دێ چونکە ژنەکەی مکـوڕە لەسەر ئەوەی سەگە بەنازەکەی لەپاڵ خۆی لەسـەر نوێنـێ دانـێ، یـان بێنگـاداری مێردەکەی یا بێ ئیزنی وی کێندەری حەز لێبی بـۆی دەچـێ.. ئایـا هـەر ڕواڵەتـە گۆڕاوە یان دۆزە نەمرەکەیە گۆڕاوە، کە دۆزی پیاو و ژنە، ئـاخۆ کامـەیان خـاوەن سەرۆکایەتی و دەسەلاتن و، کەشتیش دو سەرکردان هەڵناگرێ!

مرۆڤ ماندو دەبێ و زەحمەت دەکێشێ تا بژی.. بە ڕاوی نێو دارستان زەحمـەت دەکێشێ و، بە کشتوکاڵی زەوی ماندو دەبێ و، بەکاری دیوەخانێ ماندو دەبـێ و، بەکاری نێو کارگان زەحمەت دەکێشێ. چی گۆڕاوە؟ دیاردەی زەحمەتکێشان یان ئەو ئەرکەی کە کەس لەبەری دەرناچێ؟

بێجگە لەمانەش سەدان هەست و سەدان بیر و سەدان کاروباری دیکە..

(مرۆڤ ڕەگەزێکی جێگـیر و چەسـپاوی تێدایـە هـەرگیز نـاگۆڕێ هـەر چـەند بارودۆخ بگۆڕێ و هەر چەند ژیانی لەسەر زەویدا بگۆڕێ، چونکە ئـەو ڕەگـەزە بـە

حەقیقەتە ئەزەلیەکانەوە پەیوەستە کە گۆڕانکاریـان ناگاتـێ، و لـە پـاڵ ئەوەشـدا رەگەزێکی گۆڕاوی تێدایە. یان بڵێ: وێنە گەلێکی گۆڕاو لە جەوهەرێکی نـەگۆڕ و، باری گەشەسەندو بۆ قەوارەیەکی جێگیر، بەڵام گۆڕان و گەشەسەندنەکەی مرۆڤ لە مرۆڤایەتی ناباتە دەرێ و، یەك چرکەش لە قەوارە بەردەوامەکەی جیا نابێتەوە، بە حوکمی یەکگرتویی نەفسی مرۆڤ و پێکوە پەیوەستبونی و، گشتگیری بـۆ هـەمو ئەو شتانەی مرۆڤ لەخۆیگرتون.

هەندێ حەقیقەتی ئەزەلی لە پێکهاتەی مرۆڤدا هەن:

(لە ویستی خوداوە سەریهەڵداوە: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَـاعِلٌ فِـي الأَرْضِ خَلِيفَةً: ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی راگـەیاند: مـن دەمـەوێ بریکارێك لەسەر زەمین دیاری بکەم.﴾البقرة/٣٠.

((سەرجەم مرۆڤیش لەیەك نەفسن: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُـمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ: ئەی خەڵکینە؛ لە پەروەردگاری خۆتان ترسو هەبێ، کە هەر ئەوە ئێوەی هەر لە یەك کەسەوە خستۆتەوە.﴾النساء/١.

((لەو نەفسەش -واتە لە رەگەزەکەی- (هاوسەری) وەدیهێنا، کە تەواوی دەکـا و پێ دەگا و خۆشیدەوێ: ﴿خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَـهَا: ئێـوەی هـەر لـە یـەك کەسـەوە خسـتۆتەوە و جووتەکەشـی هـەر لـەو کەسـە خستۆتەوە﴾النساء/١. ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْـكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً: هەر لە نیشانانی ئەوە کە لە خۆتان، هاوسـەری بـۆ بەرهـەم هێنـان؛ کـە پێیـان بحەسـێنەوە و خۆشەویسـتی و ئـەوینی خسـتۆتە ناوتان.﴾الروم/٢١.

((هەمو خەڵکیش لەو نەفسە و لە هاوسەرەکەی کەوتنەوە و بون بە هۆز و گەل:

﴿خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً: ئێوەی هەر لە یەك كەسەوە خستۆتەوە و جووتەكەشی هەر لەو كەسە خستۆتەوە و لەو دوانەوە پیاوی زۆر و ژنی زۆری وەدی هێنا.﴾النساء/١ ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ: ئەی خەلكینە؛ هەر لە نێرە و مێوێكەوە ئێوەمان وەدی هێناوە و كردومانن بە چەند گەلێك و چەند هۆزێك هەتا یەكتری بناسن، بەرێزترینتان لای خودا پارێزكارترەكانتانن.﴾الحجرات/١٣.

((مرۆڤیش چنگە قوڕێكی زەوی و فویەكە لە رۆحی خودا چنگێك لە قوڕی زەوی رەگەزە ماددیەكانی تێدا رەنگدەداتەوە لە ئاسن و مس و كالیسیۆم و فسفۆر و ئۆكسجین و هایدرۆجین و، ئارەزو و هاندەرەكانی زەوی تێدا رەنگدەداتەوە و، فویەكیش لە روحی خودا رۆحی مرۆڤی رون و بەتوانا لەبەرزبونەوە و بالأبون تێدا رەنگدەداتەوە، هەروەك ویستی رێكخەر و توانای هەڵبژاردنی تێدا رەنگدەداتەوە:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِنْ سُلاَلَةٍ مِنْ طِينٍ: ئێمەین مرۆڤمان لە قوڕێكی خۆشكراو دروست كردوە.﴾المؤمنون/١٢. ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: هەرگا رێك وپێكم كرد و لەگیانی خۆم فوم پێدا كرد، ئێوە بە سوژدە بۆبردن داوەرنەوە و دەمەورۆین.﴾الحجر/٢٩. ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا: بەگیانی مرۆڤ سوێندبێ و بەوەش كە رێكی خستوە، ئەوسا هەمو تاوانباری و پارێزگاری دەویژدانیدا گەیاندوە، دیارە هەركێ گیانی خاوێن راگرتوە رزگار بوە، هەركەسێكیش دە گوناهیەوە پێچاوە، دۆڕاندویە.﴾الشمس/٧-١٠.

((ئەمانە رەگەزی جێگیر و چەسپاون هەر چەند (روالەتەكان)ی ژیان بگۆڕێن ئەوانە ناگۆڕێن.

((لە پاڵ ئەوەشدا رەگەزێکی گۆڕاو هەیە. یا بڵێ (وێنــە) گـەلێکی گـۆڕاو لـە جەوهەرێکی نەگۆڕ و (حاڵەتانێکی) گەشەسەندو لە قەوارە هەمیشـەییەکە. بـەڵام لە گۆڕان و گەشەکردنی مرۆڤ لە مرۆڤایەتی ناباتـەدەر و، بـۆ یـەك چرکـەش لـە قەوارە هەمیشەییەکە جودا نابێتەوە، بە حوکمی ئەوەی یـەکێتی نـەفس و پێکـەوە پەیوەست بونی و، گشتگیری بۆ هەمو ئەو شتانەی مرۆڤ لەخۆی گرتوە.

((کۆمەڵە حەقیقەتێکی تریش لەسەرحەقیقەتە ئەزەلیەکە راوەستاون، جا وەکـو ئەویان لێهاتوە جاویدان و هەمیشەیی و ناگۆڕێن.

((ئەوەی پێوە بەندە کە خەڵك -بە فریشکی خۆیان ئەگەر ساغ بێ- هەست بـە مەزنێتی خوا دەکەن بەگوێرەی گچکەیی خۆیان، جـا دەیپەرسـتن و، هاوکـاری لـە ژیان لێدەخوازن.

((ئەوەشی پێوە بەندە کە هەردو هاوسەر -کە خودا لەیەك نەفس خولقـاندونی- هەست بە سۆز و وپێکەوە نوسان بکەن و، هەست بکەن پێکەوە بە یـەکگرتوویی و یەکتر خۆشویستن و میهرەبانی نەبی بونیان کامل نابی.

((ئەوەشی پێوە بەندە کە خەڵکی -کاتێك دڵودەرونیان پاك دەبێتـەوە- هەسـت بەبرایەتی مرۆڤانە بکـەن، چونکـە هـەمو لەیـەك نەفسـن کـە لەگـەڵ هـەمویان بەمیهرە، جا هاوکاری یەکتر دەبن یا لە خێر و چاکە هاویەش دەبن.

((ئەوانـە رەگـەزی هەمیشـەیین چونکـە لەسـەر بنچینـەی هەمیشـەیی دامەزراون)).[1]

ئەوانەش ئەو بنچینانەن کە بیروباوەڕ و رەوشتیان لەسەر دادەمەزرێ.

***

---

[1] لە کتێبی (قبسات من الرسول).

بیروباوەڕبون بەخودا ڕەگـەزێکی جێگـیرە لـە دەرونـی مرۆڤایـەتی. ڕەگەزێکـە لەناخی فریشکەوە دامەزراوە، مرۆڤایەتی بەرەو وەدیهێنەری ڕێنمـایی دەکـا هـەر چەند لێشی بێئاگا بن. ئەو لاڕێبونانەی روشدەدەن لاڕێبونن لە چۆنیەتی تـێڕوانینی خودا، نەك لاڕێبون لە بڕواهێنان بەوەی هێزێك هەیە -هەر هێزێك- کە وەدیهێنـەر و خاوەن توانایە، گەردون و ژیان و مرۆڤـی هێناوتـە دی[1] و، ئـەرکی هەمیشـەیی پێغەمبەرانیش بریتیە لە ڕێنوێنی مرۆڤایەتی بۆ تـێڕوانینێکی راسـت، کـە دواتـر هەستی دروست و ڕەفتاری چاك و ڕێکخستنی راستی لـێ هەڵدەقوڵێ.

ئەم بیروباوەڕە (گەشە)ی نەکردوە هەروەکو لێکدانـەوەی مـاددی بـۆ مێـژو یـا توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە لەو دو سەدەیەی رابردو هەڵیانبەست، پەرسـتنی باوك و پەرستنی ئەو و ئەم و پەرستنی بت و گەشە سەندنی بیروبـاوەڕ نـەبون کـە دواتر گەیشتنە یەکتاپەرستی. بەڵکو بریتی بو گەشەسەندنی لاڕێبونی مرۆڤایـەتی لە بیروباوەڕی راست لە سەردەمە جیاجیاکانیدا. ئەوەش راست نیە -لـە مێـژودا- کە زنجیرەیەکی ڕێکوپێك لە بیروباوەڕی گومڕا بەسەر مرۆڤایەتی دا تێپەڕبوبن و لە کۆتاییدا بوبن بە هۆی یەکتاپەرستی. بەڵکو -لە مێژودا- چەسپاوە کە مرۆڤایەتی خولی یەکبەدوای یەکی ڕێنوێنی و گومڕا بوندا ڕەت بوە. لە یەکتاپەرستی و چـەند خوا پەرستی. لە داماڵینی سیفەتان و بەرجەستەکردن لەئاست خودای مەزن.

هەمو (گەشەسەندن)ی مرۆڤیش ناگاتـە ئـەو ڕەگـەزە جێگـیرە لـە جەوهـەری گەردون و ناخی مرۆڤ، تـەنیا کـاتێك لـە تـێڕوانینی راستودروست لاڕێ دەبـێ، تەنانەت ئەوکاتەی گەشەسەندن وێنە دەگرێتەوە نەك بنچینە.

---

[1] لەوانەی هەر لە بنەڕەتەوە بڕوایان بەبونی وەدیهێنەر نیە کەمینەیەکی ریزپـەڕن کـە هـەر بـە نەبو حیسابن.

لە ژیانی مرۆڤایەتیش -بە جیاوازی بـار و دۆخ و گەشەسـەندنی حاڵەتـەکانی- یان لە باری ڕێنوێنی یا گومڕابون لە تێڕوانین و زیاتر نیە.. بیروباوەڕی ڕاستەڕێ یا بیروباوەڕی لاڕێ و ڕێ ونکردو.

مرۆڤیش -بە جیـاوازی بـارودۆخ و گەشەسـەندنی حالەتـەکانی- لـەم دو بـارە بەرامبەرە بترازێ هیچی دیکەی نیە. جا چ مرۆڤی شار یـا دانیشـتوی دارسـتانان بێ.

پاشان مرۆڤایەتی لە واقیعی خۆیدا دو دۆخی هەیە، بەدوای یەکدا دێن و لێـک جودان: یان ڕێنوێنی یا گومڕایی.

هەرچی (دۆخەکان[1])ە کە لێکدانەوەی ماددی مێژو باسیان دەکا و، خـەیالێکی پێ ئاودەدا کە هێڵێکی هەڵچو لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیـە، هەمیشـە بەرەوسـەر دەچی و، هەردەم بۆ پێشەوە دەچێ.. و ئەم دۆخانە ڕواڵەت وێنـا دەکـەن و ناچنـە قولاییـەکان. وێنـەی گەشەسـەندنی مـاددی ژیـانی مرۆڤایـەتی دەکێشـن، بـەڵام حەقیقەتی ژیانی مرۆڤایەتی وەسف ناکەن.

یەك هێڵ هەیە کە هەمیشە بەرەو سەر هەڵکشێ کە ئەویش هێڵی (زانسـت)ە، چونکە بەسروشتی خۆی وایە، هەر هەنگاوێك تێیدا ڕێخۆشـکەرە بـۆ ئـەوەی دوای خۆی، بۆ شـتێکی لـە خـۆی گـەورەتر. بـەڵام هێڵـی (دەرونـی) وانیـە. بـەردەوام هەڵناکشێ و بـەهێڵێکی ڕاسـتدا نـاڕوا. بـەڵکو بـەدرێژایی مێـژو هەڵدەکشـێ و دادەکشێ و، ڕاست دەڕوا و خوار دەبێتەوە و، ڕێنوێن دەبێ و گومڕا دەبێ: ﴿لَقَـدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ، ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَـافِلِينَ: ئێمـە مرۆڤمـان لـە ڕێکـترین شـێوەدا وەدی هێنـاوە، پاشـان گێڕامانەتـەوە بـۆ پلـەی هـەرە

---

[1] دۆخەکان: الأطوار

بەرەژێر﴾التین/٤-٥. خولگەی ئەم (گەشەسەندن) یان گۆڕانەش، بریتیە لە بــاوەڕی لاڕێ یا باوەڕی دروست کە بۆ هەســتکردنی مــرۆڤ بــەخۆی دەگەڕێتــەوە، لەگــەڵ هۆشیاری بەو وزە جیاوازانەی تێیدایە و، چۆنیەتی تێڕوانینی بۆ ژیان.

هەرچی ئەو گەشەسەندنە ماددیەیە کە روودەدا، لەگەڵ گەشەسەندنی ئـابوری و گەشەسەندنی زانستی.. هەموی کاریگــەری کـاتی لـە دەرونـی مرۆڤـدا دروسـت دەکەن، پاشان هێندەی پێناچێ لادەچن و دەرون لێیــان رادێ و، دەگەڕێتــەوە سـەر داب و نەریتی و قەوارەی ناوەکی خۆی کە حوکمــی دەکـا.. هــەروەك جەســتە لـە دەرمانێکی تازە رادێ و پاش ماوەیەك کاریگەری لەسەر جەستە نامێنێ.

بــەڵام گۆڕانکــاری راســتەقینە ئەوەیــە کــە لــە نــاخی دەرونــڕا دێ.. لــەبیر و هەستەکانی.. لە تێڕوانینی بۆ خوی و تێڕوانینی بۆ دەوروبەر.. لە ســـنوردارکردنی ئەرك و ئامانجەکانی.. لە نرخاندنی رۆڵ و پلە و پایەی خۆی.

ئائەمە گۆڕانکاری راستەقینەیە، نەوەك ئوتۆمبیل و فرۆکە و گوێدرێژ!

***

پێوەری ژیار و، پێوەری (گەشەسەندن). لەو دروســتکراوە ماددیانــەدا نیــە کــە عەقلی مرۆڤ دروستیان دەکا، لەو (زانســـت)ەش نیــە کــە دەیگاتــێ. بــەڵکو لــە چۆنیەتی پێــوە کاریگــەربونیان، لەگــەڵ بەرزبونــەوە و نـزم بونــەوەی لــە پێــوەری (مرۆڤ)دا کە لە پێوەری (ئاژەڵ) جودایە.

پێوەری پێشکەوتن و دواکەوتن بەگوێرەی مرۆڤ، بریتیە لە ئاستی بەکارهێنانی ئەو سیمایانەی لە ئاژەڵ (جودا)ی دەکاتەوە —لەگــەڵ ئاســتی دوریــی لــە ئــاژەڵ و هەڵکشانی لەو بوارەی سیماکانی بەرەو رو دەچن. ئەگـــەر مــاددە و ئامێرەکــان — هەروەك (جۆلیان هێکسلی) دەڵێ لەو تایبەتمەندێتیانە بن کە مرۆڤ جیا دەکەنەوە،

ئەوا –هەروەك دیسان (هێکسلی) دەڵێ- تەنیا جیاوازی نیە و، لە تەواوی قەوارەکە دانەبڕاوە، پاشان -بەتەنیا- وەك پێوەری ژیار و، پێوەری پێشکەوتنی مرۆڤ ناشێن، ئەگەر بەسیما مرۆڤایەتیەکانی دیکە نەبەسترێنەوە و، بەرەو پێش پاڵی نەنێن.

((پێوەری راستەقینەی مەزنێتی مرۆڤ بریتی نیە لەو ئامێری رادیۆ یان تەلەفزیۆنەی کە هەیەتی، ئەو ئۆتۆمبێلە نیە کە سواری دەبێ و، جلشۆرە میکانیکیەکەشی نیە و، ئەو بۆمبەش نیە کە ژیانی سەر روی زەوی پێ کاول و وێران دەکا.. بەڵکو بریتیە لە کاریگەری و شونی ئەوانە هەموی لە هەست و سۆز و قەوارەی دەرونی بەگشتی. جا ئەگەر بیگەیەنێتە بیرۆکەیەکی فراوانتر و سەرتاپاگیرتر لە بارەی مرۆڤایەتی و، بیرۆکەی گەورەتر و بەرزتر لە بارەی ژیان، ئەوا بەراستی مرۆڤ پێی باڵا دەبێ، بەڵام ئەگەر هەستەکانی بەرەو چوارچێوەی منانیەتێکی[1] بێزراوی ببا و، روی پێ بکاتە چێژ و خۆشیە برسیەکانی جەستە ئەوا مرۆڤایەتی رو لە داڕوخانە، سەرەڕای ئەو باقوبریقەی کە چاوان لێڵ دەکا)[2]

بەڵگەی ئەمەش.. بەڵگەی ئەوەی کە پێوەری پێشکەوتنی مرۆڤ مادە نیە و، پێشکەوتنی زانستی نیە و، ئامرازەکان بەرهەمهێنان نین... ئەو بەڵگەیە بریتیە لە ئەوروپای سەدەی بیستەم.

ئەوروپا لە سەدەی بیستدا گەیشتە ترۆپکی زانست و هێزی ماددی و گەورەیی بەرهەم کە مرۆڤایەتی لەوەتەی هەیە تا ئەمڕۆ هاوشێوەی نەدیون.

---

١ منانی: أناني.

٢ لەکتێبی (الانسان بين المادية و الاسلام).

ئەوروپا لە سەدەی بیستدا گەیشتە ئاستێك لـە دابـەزینی ڕەوشـت و ڕۆح کـە مرۆڤایەتی نە لە جاهیلیەتی کۆن و نەهی تازە لەوە خراپتری نەدیوە.

کاتێك (بەرتراند ڕەسل)ی فەیلەسوفی هاوچەرخی ئینگلیز گوتـی سـەروەرایەتی پیاوی سپی کۆتایی هات، بۆیەی وانەگوت چونکە پیاوی سپی زانستی پێنەما، یـا لـە پێشـکەوتنی مـاددی بـەتاڵبو، یـا لـە هەڵکشـانی بـەردەوام لــە جیــهانی بەرهەمهێناندا ڕاوەستا، بەڵکو بۆیە وایگـوت چونکـە پیـاوی سـپی لـە نـاوەوەڕا بەتاڵبو، لە بیروباوەڕی چاك بەتاڵبو، لەگیان بەتاڵبو، لە ڕەوشت بــەتاڵبو بـە واتـا مرۆڤایەتیە فراوانەکەی نەك بەواتا سنود گەراییە بەرتەسکەکەی کە ئەمڕۆ ڕۆژئـــاوا مومارەسەی دەکات.

ئەگەر پێشکەوتنی زانســتی، یـان بەرهەمــهێنانی مـاددی، یـان شـتی دیکـە لەوانەی دەکەونە دەرەوەی دەرون کاریگەریەکی گردەبڕیـان لـە گونجـاندنی دەرونـی مرۆڤدا هەبێ، ئەوا دەبوایە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا بەرەو لوتکەی هەرە بــەرزی مرۆڤایــەتی بەرزبێتەوە لە هەمو گۆڕەپـانێکی ڕەفتـاری مرۆڤـدا. ئـەو ڕوە ڕەش و ناشـیرنەش نەدەبو کە ئەمڕۆ ڕۆژئاوا پێوەی دەڕوانێتە جیهان:

کێشەی ڕەگەز و، ئیمپریالیزم و، لێکـترازانی ڕەوشـت و، داڕوخـانی ڕوحـی و، ڕکابەری بێزراو لەسەر فراوانخوازی و خاوەنداری لەسەر حیسابی ڕێــزی مرۆڤایـەتی و، ئەو تۆقینە کاولکارەی جیهان لەترسی شەڕ و لەنێوچوندا تێیدا دەژی.

ئەو درۆ زلەش چەند بێقیمەتە کە دەڵێ ئەمڕۆ فڕۆکە وڵاتانی جیهانی لە یــەکتر نێزیك کردۆتەوە، ئەوجا خەڵك هەســتیان بـە نزیکـی شـوێن و یـەکێتی مـرۆڤ و ئەرکبونی هاوکاری لەنێوان مرۆڤایەتیدا کردوە. یا -هەروەك گوتیـان- دنیـا لـەوە تەنگتر بۆتەوە کە کێشەی تێدا بکرێ!

ئەم درۆ زلە چەند بێقیمەتە. ئەدی خەڵك كە قسـان دەكـەن لـە دەوری خۆیـان ناڕوانن؟! ئایا ئەوە ئاشتیە كە ئەمڕۆ جیهانی داگرتوە یا ئەوەی فرۆكـە و موشـەك لێكی نێزیك كردەوە؟

یان ركابەریەكی ناشیرینە كە لە مێژودا هاوشێوەی نەبوە؟

ئەوە هەستەكانن لە ناوەوە و، فرۆكە و موشەك نین.

پاشان بیروباوەڕ مەزنترین شتە لە ژیانی مرۆڤایەتی و، بریتیـە لـەو بزوێنـەرەی كە لە ناوەوەڕا دەرون دەجولێنێ و، بریتیە لە ئاراستەكارێك بۆ پۆلـە جیاجیاكـانی كردەوە و رەفتار و ویژدان.

ئەوجا گەلێك ژیاری ماددی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا تێپەڕیون و، لەنێو چـون یـا شوێنەواری رەق و بێگیان و بەتاڵیان لە ژیاندا بەجێهێشـتوە و.. بیروبـاوەڕ مـاون. لەگەڵ ئەو هەمو لاڕێبون و شپرزەبون و شێوانەی تێیكەوتوە. سەرەڕای ئەو هـەمو پیسیەی تێڕوانینە گەندەكانی مـرۆڤ تێیاخسـتوە هـەرماوە.. هـەرماوە وەك دوا پەناگا و تیشكی روناكی بەخش لە تاریكیدا

❊❊❊

بەهەمان شێوە رەوشتیش دۆزێكی جێگیر و نەگۆڕە.

چونكە رەوشت -لەلایەكەوە- بریتیە لە پیادەكردنی واقیعی بۆ بیروبـاوەڕ و، -لە لایەكی دیكەوە- بریتیە لە چۆنیەتی هەڵسوكەوتی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و لەگـەڵ خەڵك و، ئەمەش بەهەندێك پێوەندی ئەزەلی جێگیرە و حوكمكراوە كە تێپـەڕبونی مێژو هیچیان لـێ ناگۆڕێ: مەحكومە بە پێكهاتەی مرۆڤ لە مشتەقوڕێكی زەوی و فویەك لە روحی خودا و، گەل و هۆز و نەوەكان كـە لـە مـرۆڤ و هاوسـەرەكەی كەوتنەوە.

ئەوە مەسەلەیەکی مێژوییە هەر چەند رووداوەکانی مێژو بگۆڕین ئەو ناگۆڕێ. هەر چەند مرۆڤ موشەك و فڕۆکە و سەلاجە و جلشۆر و، مێشکی ئەلکترۆنی و ئامێری ئەتۆمی دابهێنێ، هەرگیز ناتوانێ حەقیقەتی پێشوی وجودی خۆی بگۆڕێ، کە خۆی و هەمو خەڵك لەیەك بنەڕەتن و، لەیەك (نەفس)ن.

ڕەوشتیش لەم راستەقینەیەوە هەڵقوڵاون و، نەلە داهێنراوە مرۆڤانە پێشکەوتوەکان هەڵقوڵاوە و، نە لە ژینگەی کشتوکاڵی یان پیشەسازی یان ئەتۆمی. لە رەگەزێکی گۆڕاو هەڵنەقوڵاوە، بەڵکو لە رەگەزێکی نەگۆڕ هەڵقوڵاوە کە خودی قەوارەی مرۆڤایەتیە و، لەگەڵ ئەو ئازوبازەی[1] بونی مرۆڤانە خستویەتیە سەرشانی و، پاشانیش بنچینەیەکی جێگیر و چەسپاوی هەبوە هەر چەند روکەشەکەشی بە گۆڕاوەکان کاریگەر بوبن.

هەر چۆن مرۆڤ لەبیروباوەڕی راست لاڕێدەبێ بەهەمان شێوە رەوشتیش لاڕێدەبێ. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ -هەروەك (زانا) بەڕێزەکانی رۆژئاوا تێیگەیشتون- کە رەوشت هیچ بنچینەیەکی جێگیری نیە! بەڵکو تەنیا واتای ئەوەیە کە خەڵك لە بنچینە جێگیرەکە لارێ دەبن کاتێك فریشکیان گەندەڵ دەبێ و لە راستەڕێ گومرا دەبن.

بەڵکو با وا گریمان بکەین کە مرۆڤ رێی رەوشتی دروستی نەگرتە بەر لە چەند ماوەیەکی دەگمەن نەبێ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا. ئەوە هەرگیز وا ناگەیەنێ کە رەوشت بەهایەکی گۆڕاوە و بنچینەیەکی جێگیری نیە. تەنیا واتای ئەوەیە کە مرۆڤایەتی هەمیشە لاڕێدەبێ و هەردەم پێویستی بە راستکردنەوە هەیە.

---

[1] ئازوبان: تبعات.

نەخۆشیە جەستەییەکان بەردەوام لە هەمو سەردەمەکانی مێـژودا بـەربلاون و، دەگمەنن ئەوانەی لە ژیانیاندا جارێك یان زیاتر توشی نەخۆشی نـەبن.. ئایـا ئـەوە مانای وایە کە پێوەرێك بۆ تەندروستی نیە و بناغەش بۆ پێوان نیە؟

نەخۆشیە رەوشتیەکانیش بەهەمان شێوە.. بەردەوام لـە هـەمو سـەردەمەکانی مێژودا بلاو دەبنەوە و، دەگمەنە تاکێك هەبێ لە ژیانی دا جارێك یان پتر دوچـاری نەخۆشی نەبێ.. بەڵام ئەمە مانای وانیە کە پێوەرێـك بـۆ تەندروسـتی دەرونـی و بناغەیەك بۆ پێوان نیە..

پێوەریش لە مەسەلەکەدا ئاشـکرایە.. مـرۆڤ -هـەروەك (هێکسـلی) دەڵـێ- مرۆڤە و، لە ئـاژەڵ جیـاوازە و، پاشـان دەبـێ قـەوارە مرۆڤانـە جوداکـەی خـۆی وەدیبێنێ و بۆ ژیانی ئاژەڵ لاڕێ نەبێ و لەڕێ دەرنەچێ.

-هەروەك (هێکسلی) دەڵێ- رێکخستن و ویست و ئازادی و هەڵبژاردن لـەنێوان هاندەرەکان و ملکەچ نەبون بۆ پاڵنانی غەریزە، لە سیماکانی مرۆڤن. ئەمانە ئـەو سیمایانەن کە لە ئاژەڵ جیایان کردۆتەوە. ئەگەر بەکاریان بێنێ مرۆڤێکی بـەرز و، خاوەن رەوشتە. ئەگەر لێشیان لاڕێ بێ ئەوە بەرەو خوارەوە دادەکشـێ.. هـەر بـە هەڵەکاریش دادەنرێ ئەگەر هەزار سـاڵیش لـە هەڵەکـەی بـەردەوام بـو، مـادام -هەروەك زانست دەڵێ- توانای وەدیهێنانی سیماکانی مرۆڤ لە کەیانیدا هەیە.

بەڵام ئەم حسـێبە سـاکارە زانایـانی ئـەوروپای مـاندو کـرد و تێگەیشـتنیانی سەراسیمە کرد کاتێك بڕوایان بـە ئـاژەڵێتی مـرۆڤ هێنـا.. چونکـە ئـاژەڵ -لـە واقیعدا- ترازوی جێگیر و، پێوەری رەوشتی نیە.

***

دۆزی نەریتەكانیش ڕەنگە كــەمێك جودابــێ.. بــەڵام لەڕاســتیدا جیاوازیــەكی گەورە نیە.

نەریتەكان لە بنەماكانی ڕەوشــت نــەرمترن، چونكــە پیــادەكردنێكی ڕەفتــاری بیرۆكەی ڕەوشتن و، گەلێك جار قالبەكانی ڕەفتار جۆراوجۆر دەبن ئەگەر چی بنــەما و ئامانجەكانیش یەكگرتوبن، پاشان نەریتەكانیش -لە ڕواڵــەتدا- پابــەندی قــالبی دیاریكراو نین و، بەدرێژایی مێژو زۆرجاران دەگۆڕێن.

گۆڕانی نەریتەكانیش لە خودی خۆیان زیانبەخش نــین و، گــیروگرفتێكیش نیــە پێویستی بە چارەسەربێ.

بەڵكو ئەوەی هەردەم مایەی زیان بێ دەرچونی نەریتەكانە لە بنــەما و ڕێكــارە ڕەوشتیەكان و بڕیارەكانی بیروباوەڕ و بڕوابون بە خودا.

كە لاوێك دەچێتە داخــوازی كچێــك، پاشــان نەختەكــەی دەدا كــە بریتیــە لــە خۆڕاگرتن بەبێ دەنگی لەبەر سەد قامچی، یان بریتیــە لــە ســەد ســەر چێــل كــە دەیداتە كەس و كاری كیژەی، یا ســەد دینــارە، یــا هــەردو بنەماڵــە مەســرەفەكە دەكێشن.. جەهازەكە بۆ خۆی دێنێ یا خێزانی بوك بۆی دەهێنــن، یــا بــوك و زاوا ڕێدەكەون بۆ ئامادەكردنی.. ئەمانــە هــەموی نــەریتن و دەگۆڕێــن و، زیــانیش لــە گۆڕانیاندا نیە.. بەڵكو زیان لەوەدایە كاتێك نەریتەكان لە خــودی بیرۆكــەی زەواج دەردەچن و، دەبنە داوێنپیسی.. بەڵام چ داوێن پیسیەك..

هەروەها كە دایك بچێتە خوازبێنــی یــا پــیرەژنێك، یــا كــوڕە بۆخــۆی بچــێ.. هەموی نەریتن دەگۆڕێن، زیانیش لەوەدا نیە كە دەگۆڕێن. بەڵام زیان لەوەدایــە كــە خوازبێنی نەمێنێ، بەڵكو كچ و كوڕ بۆ ڕابواردن بەشێوەی ئاژەڵان بگەنە یەكتر.

بنەماڵەش لە باپیران و باوان و کوڕان و نەوەکان پێکدێ، وەك ئەو قوچەکەی بنچینەکەی بەبێ کۆتا فراوان دەبێ.. یا تەنیا ژن و مێرد و منداڵەکانن و.. خەزوریش لەناو ماڵ یا لە دور دەژی و.. دایك بە ئامۆژگاری دێتە نێوان یا واز لە هەردوو هاوسەران دێنێ بۆ خۆیان پێکبێن.. هەمو نەریتێ و دەگۆڕێن و، زیانیش لەوەدا نیە بگۆڕێن. بەڵکو زیان لەوەدایە کە پەیوەندیەکانی خێزان بپچڕێن لەبەر هۆکاری عاتیفە یا هۆکاری ئابوری یا ڕێکخستنێك کە دەوڵەت دایەزرێنێ.. یا لەبەر هەر هۆکارێکی تر بێ.

جا کەواتە نەریتەکان -لەگەڵ نەرمیان- لە بنەما جێگیرەکانی قەوارەی مرۆڤ بەدەر نین کە: ڕەوشت و بیروباوەڕن، دەنا دەبنە لاڕێبون و مایەی ئەنجامی حەتمی، ئەگەر چی عورفیش قبوڵی بکا و، کتێبی ملەستوری وەك بڕوبیانو بۆ دابنرێ!!

***

ئەوە چیرۆکی گەشەسەندن بو لەوێنە مەعقولەکەیدا کە واقیع پاڵپشتی دەکا. نەك لەو وێنە شێتەی کە لەو ماوەیەی دوایی لە ئەوروپادا خەڵکی فریو داوە.

جەوهەرێکی نەگۆڕ و وێنەگەلی گۆڕاو.. لە گەردون و ژیان و مرۆڤ بێجیاوازی و، گۆڕانی بەردەوامیش بنەما نەگۆڕ و چەسپاوەکان لانابا و، مرۆڤ بەرەڵڵا ناکا، تا لەزەوی گەندەڵی بکا و بۆ نێو قوڕەشینی ئاژەڵێتی بچێتە خوار و، ئینجا بشڵێ کەوا گەشە دەکا و پێشدەکەوێ.

هەرچی (حەتمیەتی) گەشەسەندنیشە ئەوە تائێستاش فیتنەیەکی کارەساتە!

لە لێکدانەوەی ماددی بۆ مێژودا ئەم حەتمیەتە دیار و بەرجەستەیە، کە قۆناغەکانی حەتمیەتی گەشەسەندن دیاریدەکا و، بەراشکاوی دەڵێ: هیچ پەیوەندی بە ئیرادەی مرۆڤەوە نیە!

تەنانەت ئەوانەی لە ئەوروپا تەواو بڕواشیان بە لێكدانەوەی مـاددی نیـە -كـە كەمینەی هەرە كەمن- ئەوا لە لایەنێكی دیكە بڕوا بە حەتمیـەت دێنـن، لایـەنی لاوازبونی تاك بەتـەنیا و، كەنـەفتی و دەستەوەسـتانی لـە ئاسـت ڕوبەڕوبونـەوەی كۆمـەڵگـە و، لـەڕوی ئـەو گەشەسـەندنە (حـەتمی)ەی كـە لـە ئـەنجامی گۆڕانـی بارودۆخەكان دروستدەبێ.

هەردوكیان بڕوایان بە سلبیەتی مرۆڤ هەیە!

(داروینیزم)یش هۆكاری ڕاستەوخۆی بڕوابون بەو حەتمیەتە بو، چونكە هێڵێكـی دیاریكراوی بۆ گەشەسەندن كێشا، پاشان گوتی: بونەوەری زیندو ناتوانێ لەبەر ئەو فشارە دەربچێ كـە گەشەسـەندن دەیخاتـە سـەری و، ناچـارە وەرامـی بـارودۆخی ژینگەی دەوروبەری بداتەوە و.. هەر ژینگەشە ڕێگای بۆ وێنە دەكێشێ.

لێكدانەوەی ماددی مێژوش لەوە زیاتری نـەكرد كـە حەتمیەتەكـەی بـۆ بـواری مرۆڤ گواستەوە -وەك یەكێك لە جۆرەكانی ئاژەڵ- و بەسەر هەمو ڕەنگە چالاكیە تاكە كەسی و كۆمەڵایەتیەكان پیادەی كرد و گوتی هەر ئەمـە تاكـە لێكدانـەوەی زانستی ڕاستە!

بەمجۆرە لێرەشدا دەبینین كە مەسەلەكە لە كۆتاییدا هەر لە ئـاژەڵێتی مرۆڤـەوە هەڵقوڵاوە!

هێندەش بەسبو كە بۆ قسەی (جۆلیان هێكسلی) بگەڕێینەوە بۆ باگۆدانـەوەی[1] بانگەشەكانی لێكدانەوەی ماددی بۆ مێژو كاتێك لە بارەی تاكێتی مـرۆڤ دەڵـێ: ((لە كۆتاییدا مرۆڤ لە چۆنیەتی گەشەسـەندنیدا هـاو نمونـەی لـە نێـوان ئاژەڵـە باڵاكاندا نیە)) یان دەڵێ: ((مرۆڤ خاسیەتێكی دیكە بایۆلۆجی هەیە، كـە بریتیـە

---

١ باگۆدانەوە: ڕد.

لە تاکایەتی مێژوی گەشەسەندنی)). یان دەڵــێ: ((هــەرچی مرۆڤــە بەشـێوەیەکی ڕێژەیی لە ڕەفتارەکانیدا ئازاد بوە –ئازاد لە وەرگرتن و لە بەخشینیشــدا..)) یـان دەڵێ: ((بەڵام مرۆڤ بەشێوازێك گەشەسەی سەند کە وای لێکرد لە دەست هەندێك لە جۆرەکــانی ڕکابــەری دەربازبــێ، لەگــەڵ کردنــە بــەندەی جۆرەکــانی دیکــە و، ڕێکخستنی بــارە سروشــتی و بایۆلۆجیــەکان لــە زۆرینــەی بەشــە وشــکانی گــۆی زەوی)).

واتە.. مرۆڤ هێزێکی کارای پۆزەتیفە، نەك هێزێکی نێگەتیڤ..

هێندە بەسبو تەنیا بۆ ئەم قسانە بگەڕێنەوە تا باگۆی ئەوانە بدەینەوە کە باسی حەتمیەتی گەشەسەندنی مرۆڤ دەکەن، ئەو حەتمیەتــەی کــە بــە ڕاشــکاوی دەڵــێ: مرۆڤ توانای هەڵسوکەوتی نیە و، ویستی لەو ڕوداوانە نیە کە بەسەری دێن!

بەڵام ئێمە بە هێندە واز ناهێنین و.. هەنگاوێکی دیکەش هەڵدێنین.

لێکدانــەوەی مــاددی بــۆ مێــژو و حەتمیــەتی گەشەســـەندن.. ڕاســـتەقینەن! ڕاستەقینەیەك کە مایەیەکی لە مێژوی دورودرێــژی مرۆڤــدا هەیــە! بــەڵام لەیــەك باردا. ڕاستەقینەیە کاتێك مرۆڤ ڕەشکردنەوەی قــەوارەی خــۆی (هــەڵدەبژێرێ) و، خۆی دەداتە دەست ڕوداوەکان! ئەو کاتە نابێتە هێزێکی ئیجابی و، هیــچ کێــش و حیسابێکی نابێ و، ئەو کاتە دەبێتە بڕێکــی ســالیب و هــەمو شــتێك دەســت لــە کاروباری وەردەدا و، ئەمیش لە هیچ شتێکدا هەڵسوکەوت ناکا!

ئەمەش هەندێ جار ڕودەدا! لە ئەوروپا لەم دوسەدەیەی دواییدا ڕویدا کە مرۆڤ خۆی لەبەر یەك تاکە شەپۆڵی گەندەڵی نەگرت، بەڵکو خۆی دادەست شەپۆڵەکە، تا لە کۆتاییدا پیاوی سپی تێیدا نقوم بو!

بەڵام تەنیا لەخۆبایی بونی ئەوروپی وایە كە مێژوی مرۆڤایەتی بەو روداوانە لێكدەداتەوە كە لە ماوەی سەدە و نیوێكدا لە ئەوروپا رویاندا، لە ماوەیەكی نسكۆ ئامێزدا كە هەرچی تێیدا رویدا ئەوەبو كە ئەوروپا بە بێبڕوایی لەژێر دەسەڵاتی زۆردارانەی كڵێسا چوە دەر و، خۆی دایە دەست شەیتان!

ئێستاش بۆ شوێنێكی دیكە لە زەویدا و، بەشێكی دیكەی مێژو دەگوازینەوە و دەچین بۆ جەرگەی حوكمی ئیسلامی.

چ هێزێكی ماددی.. چ گۆڕانكاریەك بو لە شێوازەكانی بەرهەمهێنان.. لە دورگەی عەرەبی و لەهەمو جیهاندا.. كە -بەشێوەیەكی حەتمی- بوە هۆی دەركەوتنی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵلا ﷺ كە بانگەوازی بۆ ئەم ئیسلامە دەكرد و موژدەی ئاینە نوێیەكەی دەبەخشی؟

دەڵێن عەرەب لە جەزیرەی عەرەبیدا لە دۆخی (هۆز) دەرچوبون و بەرەو ئەوە هەنگاویان دەنا كە ببنە نەتەوە.. بۆیە دەركەوتنی موحەممەد ﷺ مەسەلەیەكی سروشتی بو و لەگەڵ سروشتی روداوەكان دەگونجا و، وەرامدانەوەی حەتمیەتی گەشەسەندن بو.

لەگەڵ ئەو سازاندنەی لەو قسەیەدا بەدی دەكرێ، تا لە مشتومڕ دوركەوینەوە دانی پێدا دەنێین!

لە هۆزەوە بۆ نەتەوە.. مەعقوڵە!

بەڵام ئایا ئیسلام ئاینی (نەتەوەی عەرەب) بو!؟

چۆن تەنیا ئاینی عەرەبان بو لە كاتێكدا -لە مەككە- پێش چونی بۆ مەدینە و، پێش دامەزراندنی دەوڵەت و، پێش كۆبونەوەی پشتیوانان و، پێش كۆكردنەوەی هێزی ماددی و توانای جێبەجێكردن.. تەنانەت پێش ئەوەی بێجگە لە چەند

کەسێکی بێ جێ و ڕێ و پەرتەوازە لە دەشت و دەر بڕوای پێ بێنن، کە لــە لایــەن خزم و کەسانەوە ڕاونرابون، ویڵ و سەرگەردان بەبێ پارێزگاری و بێهیوا لە داهاتوی نێزیك سەرەڕای داهاتوی دور.. چۆن وابو کە لەو بارودۆخەدا لە ســورەتی (قەلــەم) کە لەو سورەتانەی قورئانی پــیرۆزە کــە لــە ســەرەتا دابــەزیون دەربــارەی قورئــان دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ لِلْعَالَمِينَ: قورئان بیرەوەریەکیشە بۆ هــەمو خــەڵکی دنیایە.﴾.

هەروەها لە سورەتی (سەبەء)ی مەککــەیی ڕاشــکاوانەتر دەفــەرموێ: ﴿وَمَــا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا: ئێمە تۆمان بۆیە نارد کە بۆ گشت خەڵکی سەرزەمین مژدەدەر و ترسێنەر بی.﴾السبأ/٢٨.

هەروەها لە سورەتی (ئەعراف)ی مەککەیشدا دەفەرموێ:

﴿قُلْ يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُــــمْ جَمِيعًــا: بڵــێ: خەڵکینــە؛ ئــەمن پێغەمبەری خودام بۆ ئێوە هەموتان.﴾الأعراف/١٥٨.

پاشان ئایــا ئیســلام ئــاینی (نەتــەوەی عــەرەبی)بــو کــە پێغەمبــەری ئیسـلام دەیفەرمو: ((النَّاسُ سَوَاسِيَةٌ كَأَسنَانِ المِشط، لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَى أَعْجَمِــيٍّ إِلَّــا بِالتَّقْوَى: خەڵك وەك ددانی شانە یەکسانن، عەرەبێك هیچی لە عەجــەمێك زیــاتر نیە مەگەر بەتەقوا؟))

ئایا ئەمە بانگــەوازی پێکــهێنانی نەتەوەیــە، یــان بانگەوازێکــە بــۆ تێکــڕای (مرۆڤایەتی) هەر لە یەکەم هەنگاوی ڕێگاکەیەوە؟!

ئایا حەتمیەتی مێژویی ئاوایە ئەی ئەوانەی ئارەزوتان لێکدانــەوەی مادديــە بــۆ مێژو؟ لە هۆزەوە بۆ مرۆڤایەتی لەماوەی چەند ساڵێکدا ؟!

نەتەوەکان لە هۆزەکان پێکدێن.. بەڵام ئایا ئەم هەنگاوە سیســـتەمە فیکــری و

عەقیدی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکان دەگۆڕێ.. بەبێ گۆڕانکاری ماددی و گۆڕان لە شێوازەکانی بەرهەمهێنان؟

لۆژیکی ژینگە[1] نەبو ئەو لۆژیکەی ئیسلام هێنای.. بەڵکو ململانێکە -یەکجار- درێژ بۆوە لە نێوان لۆژیکی ژینگە و لۆژیکی ئیسلامی، هەتا بیروباوەڕە نوێیەکە بەو هەمو هێز و ڕەگەزە چاك و باڵا دەستانە زاڵبو و پاشەکشەی بەلۆژیکی ژینگە کرد و، لە دەروناندا دوایخست.

لۆژیکی دەوروبەر لە بەهای ئافرەتی کەم دەکردەوە و لە ریزی ئاژەڵانی دادەنا، جا هەر بە کۆرپەیی لە چاڵ دەنرا و، بە قێز و کینەوە پێشوازی لێدەکرا و، بەکیژینی زەلیل دەکرا و، بە ژنێتیش وەك هەر شتێکی دیکە بە سامان(موڵك) دادەنرا. خودی ئافرەتیش لەم دۆخ و بارەی توڕە نەبو، کەسێکیش لە پیاوان نەبو داوای بارێکی دیکەی بۆ بکا. نە لە دورگەی عەرەبی و، نە لە هیچ شوێنێکی دیکەی سەر زەوی.

ئیسلامیش هات و گوتی ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً: هەرکەسێ کرداری باشە و بەباوەڕە-چ نێر، چ مێ- هەتا دەژی وا دەکەین بەخۆشی بژی. ﴾النحل/٩٧.

﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لاَ أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ: پەروەردگارتان ئاوا بە دەنگیانەوە هات، کە: من کردەی هیچ مرۆڤێك-لەنێر و مێ- بەبێ پاداش ناهێڵمەوە؛ هەمو لەلای من چون یەکن. ﴾آل عمران/١٩٥

هات و فەرموی: ﴿عَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ: بەچاکە لەگەڵیاندا بژین. ﴾ ئەوجا

---

[1] لۆژیك: منطق. ژینگە: بيئة.

بنەما و یاسا و ئاراستەکردنی بۆ ئەو چاکە کاریە دانا.

هەروەها هات -لەپاڵ یەکسانبون لە مرۆڤایەتی و، یەکسانی لەلای خودا- مافی مولکداری بە ئافرەتان دا: ﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالأَقْرَبُونَ: لە کەلەپوری دای و باب و خزمی نزیك- کەم بێ یان زۆر- نێرینە بەشی خۆی هەیە و مێوینەش تیا بەشدارە.﴾النساء/٧.

﴿لِلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبُوا وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِمَّا اكْتَسَبْنَ: پیاوان بەپێی کۆشش و کردەوەی خۆیان، ژنەکانیش بەرامبەر بە کردەوەیان -هەرکام- بەشی خۆیان هەیە.﴾النساء/٣٢.

ئەمەش مافێکە هەتا سەدەی بیستەم فەرەنسا نەیدابوە ژنان.

لۆژیکی ژینگە لۆژیکی زاڵبونی خاوەن هێزبو نەك خاوەن حەق، گۆڕانی عەرەبیش بۆ نەتەوە -بەشێوازێکی حەتمی- ئەو لۆژیکەی پێ نەدەگۆڕا، چەندیشن ئەو نەتەوانەی تا ئەم ساتەی سەدەی بیستەم ئەم لۆژیکەی تێدا باوە!

ئیسلام هات و مافی دا گشت خاوەن مافێك، تەنیا بەهۆی مرۆڤایەتیەکەی، نەك بەهۆی هێز و دەسەڵات، تەنانەت گەر موسڵمانیش نەبێ مادام لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا دەژیا و، نۆ ئایەتیش لە سورەتی (نیساء) دابەزی تا جولەکەیەك بێبەری کا لەوەی کە بە زوڵم تۆمەتبار کرابوو، چەند پیاوێکی خاوەن پشت و بەهێزی مەدینە پیلانیان لەدژ دانابو، لە کاتێکدا ئەو چ پشت و پەنایەکی نەبو.[1]

---

١ سورەتی (النساء ١٠٥-١١٣) لە یەکێك لە ئایەتەکانیشدا وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو جولەکە بێتاوانە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَكْسِبْ خَطِيئَةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِ بَرِيئًا فَقَدْ احْتَمَلَ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا: هەرکێ بە هەڵە یان بە قەست، تاوانێکی لێ رویدا و بیخاتە سەر بێگوناهێك، ئاشکرا باری تاوانی بوختانی لەسەر شانە.﴾النساء/١١٢.

لۆژیكی ژینگە وابو كە هێندە ڕێزی سەرۆك هۆزی -یا پاشـا كـاتێك نەتـەوەی پێكدەهات- دەگرت تا دەیكردە خواوەندێـك و چـی دەكـرد لێـی نـەدەپێچراوە و، ئەمەش ئەو كات لۆژیكی هەمو دونیا و حوكمرانانی دنیا بو، جا گەر ئیسـلام وای لەم نەتەوەیەی كرد بگاتە ئاستی لوتكە لە هۆشیاری سیاسی كە وا لە تاكێكی نێو عەوامی موسڵمانان بكا كە بە هێزاترین جێنشین لە مێژوی ئیسـلامدا -عومـەری كوڕی خەطاب- بڵێ: ((سوێند بەخوا ئەگەر خواریەكت لـێ ببینین بەدەمی شمشـێر ڕاستت دەكەینەوە))! ئەوجا وا لە عومەریش دەكا كە بۆخۆی لەو قسـە بوێرانەیـە توڕە نەبێ، بەڵكو ستایشی خودا بكا!

هەروەها لۆژیكی ژینگە وای لە بەخشندەیی عەرەبان كردبو كە لەو ڕێزلێنـان و بەخێر هێنانەدا كورت هەڵێ كە كاروانەكان ڕێ و ڕێ باسیان بكەن و، بەكەڵك خـۆ هەڵدانەوەی نێو هۆزەكان بێ، بەڵام سۆز بەرامبەر فەقیر و هەژاران، ئەو سۆزەی لە سەرچاوەیەكی تەواو مرۆڤانەوە هەڵدەقوڵا و بە ئامانجی ئارەزویەك یا شانازیەك یـا خۆهەڵكێشانێك نەبو، مەسەلەیەك بو بـە دەگمـەن لـەو ژینگەیـەدا رویـدەدا! جـا ئیسلام هات زۆر بەتوندی داوای ئەوەی دەكرد لەماڵی خودا (ماف)ی هەژار بـدرێ و، ڕێزی لـێ بگیرێ و، سۆزی بـۆ بنوێـنرێ و، دڵـی بدرێتـەوە، تەنانـەت ئیسـلام ئەمەی كردە فەرمانەك بۆ خودی پێغەمبەری خوا ﷺ كە هـەرگیز پێویسـتی بـەو فەرمانەش نەبو: ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلاَ تَقْهَرْ، وَأَمَّا السَّائِلَ فَلاَ تَنْـهَرْ: سـا تـۆش هـەتیو مەڕەنجێنە، دەرۆزەكـەر مەتارێنـە.﴾الضحـى/٩-١٠ بـەڵام كـە ئـەو فەرمانـەی ئاراستە كرا بۆ ئەوە بو كە گرنگێتی و بایەخەكەی دەركەوێ و بزانرێ كە ئەركـە و دەبێ جێبەجێ بكرێ.

هەروەها لۆژیكی ژینگە -و لۆژیكی هەمو جیهان لەوان ڕۆژانەدا- گـەورەكانی بە گەورە دادەنا و بەندەشی دەهێنا ئاستێكی نێزیك لە پلـە و پایـەی ئـاژەڵ، بـێ

ژمار سوکایەتی پێ دەکرا و ئەشکەنجە دەدرا و دەکوژرا.

ئیسلامیش هات و کچە پلکی پێغەمبەری خوا -کە قورەیشی بـو- کـردی بـە خێزانی زەید.. کە بەندەیەکی ئازادکراو بو، هات ئەو کۆنەبەندەی کردە سـەرکردەی سوپایەك کە ئەبوبەکر و عومەری وەزیران و جنێشینانی پێغەمبەری تیادا سـەرباز بو.

پێغەمبەری پایەدار دەفەرموێ: ((مَنْ قَتَلَ عَبْدَهُ قَتَلْنَاهُ وَمَـنْ جَـدَعَ عَبْـدَهُ جَدَعْنَاهُ: ئەوەی بەندەی خۆی بکوژێ دەیکوژین و، ئەوەی بەندەی خۆی هەتك بکـا هەتکی دەکەین.)). ئەمەش بۆیـە نـەبو کـە یـەکێك داوای ئـەو رێزلێنانـەی بـۆ کردبن..

لەبەر ئەوەش نـەبو کـە بـاری ئـابوری یـا پەیوەندیـەکانی بەرهەمـهێنان یـان ماددەکانی بەرهەم کەمترین گۆڕانکارییان بەسەر هاتبێ!

هەروەها لۆژیکی ژینگە باوەڕی بە مولکداری تاکەکەس هەبو بـە ڕەهـایی لـە هەمو کۆت و پێوەندێك و، دور لە هەمو یاسایەك.

ئیسلامیش هات بە سیستەمێك ئەو مولکدارێتیەی رێکخست کە تا سەردەمی ئێستا جیـهان نەگەیشـتبوە بەشێکیشـی، ئـەمیش پاشـئەوەی بـە دۆزەخـی دەرەبەگایەتی و سەرمایەداری داخ بو و ئازاری چەشت، ئیسلام هات و گوتی مـاڵ مـاڵی خودایـە و کۆمـەڵیش نمایندەیـە و، تـاکیش تیـایدا فەرمانبـەرە، بـەچاك ئەنجامدانی و بەجێگەیاندنی مافەکانی شایستەی دەبێ، بەڵام ئەگەر گوێی نـەداێ و مافەکەی بەجێنەگەیاند بۆ کۆمـەڵ دەگەڕێتـەوە کـە یەکـەم خـاوەن مافـە لـەو ماڵەدا، ئەوجا دەقێکی هاوردوە لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی ﴿كَيْ لاَ يَكُونَ دُولَةً بَيْـنَ الأَغْنِيَـاءِ مِنْكُـمْ: نـەك ببێتـە سـەرمایەی ئـاڵوگۆڕکردن لـەنێوان

دەوڵەمەندەکانتان.﴾الحشر/٧.

جا لۆژیکی ژینگە بەمشێوازانە و هیدیکەش بوە.. ئیسلامیش هات ئەو لۆژیکەی ڕەشکردەوە و لۆژیکی دیکەی تەواو دوری لەباتی دانا، تەواو بەو ژینگەیە و هەمو ژینگەکانی دیکەی ئەو ڕۆژان نامۆ بو، قسەکانیش ناکاتە مەبدەئی (نمونەیی) هەڵواسراو لە بۆشایی دا، بەڵکو کردیە واقیعێکی هەستپێکراوی وا لەو مرۆڤانە ڕەنگی دایەوە کە لەسەر زەوی دا دەژیان و ڕوی دڵیان لە ئاسمان بو!

جا ئەمە چۆن ڕویدا؟

چ حەتمیەتێکی مێژویی و چ لێکدانەوەیەکی ماددی دەتوانێ ئەو سەیر و سەمەرەیە لە مێژوی مرۆڤدا لێکداتەوە؟!

یەك شت هەیە دەکرێ لێکبدرێتەوە.

کاتێك مرۆڤ بڕوایەکی ڕاستەقینە بەخودا دێنێ و بیروباوەڕێکی دروست دڵی دادەگرێ. ئەو موعجیزانە دروست دەکا!

مرۆڤ گەورەترین هێزی سەر ڕوی زەویە ئەو کاتەی باوەڕ بە خودا بێنێ. چونکە ئەو کاتە دەبێت وزەیەکی ئاراستەکراو. دەبێتە هێزێکی کارا و خاوەن ویست لەسەر ڕوی زەوی -بە ئیزنی خودا- چونکە مرۆڤ جێنشینی خوایە.

خوداش بە خەلکی دەفەرموێ: ﴿وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِنْهُ: هەرچی لەناو عاسمانەکان و زەمیندان، هەمو هی ئەون، ئەو بۆ ئێوەی کەوی کردون.﴾الجاثية/١٣.

خوا -ی پاك و بەرز- بۆ خەلکی ڕامکردوە. کەواتە هەرچی هەیە بە مۆڵەتی خوا بۆ خەلکی ڕام و کەویە، بۆ وان دەستەمۆیە واتە مرۆڤ ئەو هێزە کارایەن

دەتوانن هەڵوێست وەرگرن، نەك ئـەو بـڕە نێگەتیڤـەی هـەمو شـتێك دەسـت لـە کاروباری وەردا و بۆ خۆی دەست لە کاروباری هیچ شتێك وەرنەدا!

ئەوە باری رەوای مرۆڤە. ئەوە شوێنی شایستەیەتی. ئـەو شـوێنەی شایسـتەی جێنشینی خوایە لە زەویدا.

جا کاتێك مرۆڤ بەئاگا دێتەوە و شوێنی شیاوی خۆی دەناسێ، چیدی ناچێتەوە بەر ئەو فاکتەرانەی کاریگەریان لەسەری هەیە و ئەو کاریگەری نیە، بەڵکو دەبێتە هێزێکی پۆزەتیف -بەلای کەمی- لەگەڵ هێزە ماددیـەکان کـارێك دەکـا. ئەگـەر نەشڵێین بەسەریدا زاڵ دەبێ و دەستەمۆی دەکا.

هەر بەتەنیا هێزی ماددیش نیە کە ئیسلام بۆ هەڵوێستی نێگەتیف و پۆزەتیـف لە ئاستیدا ئاراستە دەکا.

بەڵکو بەهەمان شێوە بارە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی و یاسایی و مێژویی و روحیەکانیشە.. لەگەڵ هەمو چالاکیەکانی مرۆڤایەتی.

﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِـــــهِمْ: خـوا لـو هیـچ گـەلێك ناگۆڕێ، تا ئەوان دڵیان نەگۆڕن. ﴾الرعد/١١

ویستی خوا وای خواستوە، لە چاکـە و بەخشـندەیی خـۆی -کـە مـرۆڤ ببنـە ماددەی کاری سەر زەوی و، ببنە ماددەی گۆڕانکـاری. مرۆڤـە کـە کـار دەکـا و، مرۆڤە کە بەرهەم دێنێ و، مرۆڤە کە سیستەمان دادەمەزرێنێ و بارەکـان دێنێتـە ئارا و، هەر مرۆڤیشە کە واقیع دەگۆڕێ و.. گۆڕانیش ویستی خودایـە و، خـوداش دەستەوەستان نیە لەوەی باری خەڵکێك بگۆڕی بێئـەوەی خۆیـان بگـۆڕن، چونکـە ئاسمانەکان و زەوی هەرچی تێیاندان مولکی وین و، هەر خوا بەسـەر بـەندەکانیدا زاڵە و، تاکە مشورگێڕی هەموانە و بەچی بیەوێ و چۆنی بوێ هەڵیاندەسـوڕێنێ..

بەڵام ناوای خواستوە.. کە مرۆڤ ئەندامێکی ئیجابی بێ لە ژیاندا و، گۆڕانکاریش بە ویستی مرۆڤەوە بەند بێ، لە ڕێگای ئەوەوە بێتە دی، لەوێڕا بێتە ئارا و، دەگەڵ هەمو قەوارەکەیدا، لە کار و فیکر و هەستونەستی تێکەڵ ببێ.

چ ڕێزلێنانێك لە سەرەوەی ئەم ڕێز لێنانەیە؟

لەگەڵ ئەمەش مرۆڤ خۆی پەنا دەدا و پاشە کشە دەکا و، خـۆی لـە جێگـەی ئاژەڵ و بێگیان دادەنێ و، خۆی بەردەداتەوە تا ڕوداوەکان بیهاژۆن و بەخۆی ڕەوتی ڕوداوەکان ناکێشێ.

نەخێر! کاتێك وادەکا کە بڕوای بەخوا نـەبێ و، حەقیقـەتی خۆشـی نەناسـێ و بڕوای پێ نەبێ.

بەڵام کـاتێك بـڕوا بـە خـوا دێنـێ و بـڕوای بـە خـۆی دەبـێ ئـەوا حەتمیـەتی گەشەسەندن بەدوای ناکەوێ و، نە بۆ لێکدانەوەی ماددی مێژو ملکەچ دەبێ و، نە بۆ هیچ لێکدانەوەیەکی دیکە جگە لە لێکدانەوەی مرۆڤانەی تەواو، کە مرۆڤ لـە هەڵوێستی ئاراستەکاری کارای خاوەن ویست دادەنێ.

ئەگەر ئەوروپاش بڕوای بە خوا هەبوایە و، بڕوای بە مرۆڤایەتی مرۆڤ هێنابـا، لێنەدەگەڕا ڕوداوەکان لەوێدا بەم ئاراستەیە بڕۆن و، ڕا و ئاراستەیەکی دیکەی دەبو و، توانای ڕاوەستانی لەبەردەم نسکۆی (حەتمی) لەخۆی بەدی دەکـرد کـە ڕەوشـتی گرتۆتەوە و کۆمەڵگەکەی لێکترازاندوە و، شۆڕشی پیشەسازیش یا شەر یان ڕوداوی دیکە نەیاندەتوانی بەو شێوە توندە لەبار یەکی ببـەن کـە مـاڵوێرانی و کاولکـاری بەسەربەخۆی و دنیادا هێنا.

***

جا مەسەلەکە هەر چۆن بێ.. ئەوە ئەو چیرۆکە بو کە بە داڕوخانی ڕەوشت و نەریتەکان کۆتایی هات و، ئەو (روداوانە) بون کە بەلای کەمی ئەو داڕوخانە لێك دەدەنەوە -ئەگەر نەبن بەبیانوش بۆی.

بەڵام ئێمە؟ ئەدی ئێمە بارمان چۆنە؟ چ (روداوێك) لە ژیانی ئێمەدا رویدا ببتە بیانوی ئەو داڕوخانەی کە لە دەستی دەناڵێن. یا بەلای کەمەوە لێکی بداتەوە؟ چیە بێجگە لەو کۆیلایەتیەی بۆ رۆژئاوای ئیمپریالیست لەناخماندا ڕەگی داکوتاوە کە هاتوە بۆ ئەوەی ئاین و ڕەوشت و نەریتەکانمان بڕوخێنێ و، تا بۆخۆی هەر سەروەر و دەسەڵاتدار بێ؟

ئایا هیچ هۆکارێکی ڕاستەقینەی دیکە دەمانگەیەنێتە ئەو خاو و خلیچکی و شل و شۆق بون و سەرەو لێژبونەوەی ئێستا تێی کەوتوین؟

ئایا هیچ هۆکارێکی دیکە هەیە.. با ڕاشکاوین!

# با ڕاشکاو بین

با راشکاو بین!

با لەگەڵ خۆماندا راشکاوبین لە ئاست هەڵوێستمان بەرامبەر ئاین و رەوشـــت و نەریتەکان.. بۆ لە واقیع هەڵبێین و سەری خۆمان لـەنێو زیخـەڵاندا نقـوم کـەین..؟ بۆچی خۆمان دەسخەڵەت دەین و خۆ بە درۆیان هەڵواسین؟

یان.. بۆ بەقەستی درۆ بکەین و خەڵکی دیکە گومڕاکەین؟

با راشکاو بین!

* * *

ئایا هیچ هۆکاری (بابەتی) هەن بۆ ئەو لەباریەکچونـــە رەوشـتیەی کـە ئـەمڕۆ مومارەسەی دەکـــەین.. یـان ئەگـەر دەربڕینێکـی بەرامبـەریان بـەکارهێنا: ئایـا (بەرەلایی)و دەربازیون لە هەمو کۆتێك هۆکاری بابەتیانەی هەیە؟

ئەوروپا لەبەر زۆر هۆکار کە پێشتر باســانکرد لێکـترازا.. بـەڵام ئەمــە ئابتـە بیانوی بێڕەوشتی و، شەرعیەتی ناداتێ و، لە تاوانی ئەو دابەزینە ئاژەڵانەیـە کـەم ناکاتەوە کە ئەمڕۆ ئەوروپا مومارەسەی دەکا، بـەڵکو تـەنیا ئـەو هەڵوەشـانەوەیە (لێکدەداتەوە) کە رویدا.

ئەدی ئێمە بۆچی لێك هەڵوەشاینەوە؟

ئەو (روداوانە) چ بون ئێمەیان توشی لێکترازان کرد؟

ئایا ئێمەش کڵێسایەکمان هەبو بە نوستویی و وەئاگایی شوێنمان کەوێ و خاوەی[1] قورسمان لێوەرگرێ و زەبونانە ملکەچی پیاوانی دینیمان بکا و، لێمان حەرام کا بیر لە گۆناسایی زەوی، یا لە پایەی مرۆڤ لە گەردوندا، یا لە دادگەری کۆمەڵایەتی، یا رژێمە سیاسیەکان بکەینەوە، یان بە زانستە کرداریەکانی وەك نوژداری و فەلەك و سروشت و کیمیا و روەکزانی و ئاژەڵناسی خەریك بین، یا بەدنیادا بگەڕێین بۆ بژێوی پەیداکردن؟

ئایا هزری ئاینی وامان هەبوە کە بیرۆکەی گەشەسەندن لە گەردون و ژیان و مرۆڤ رەتکاتەوە.. جا کاتێك بیری گەشەسەندن بەرەو رومان هات ئاینمان وەلانا و لەگەڵ گەشەسەندنی زانست بەرەو (گەشەسەندن) چوین؟

ئایا بە درێژایی هەمو مێژوی ئێمە دژایەتیەك لە نێوان ئاین و زانستدا هەبو وەك ئەوەی لە ئەوروپا رویدا، یا هەر لە ویژدانی ناوەوەمان لێکدورکەوتنەوەیەك لە نێوان مرۆڤ و خوادا رویدا، هەروەك لە ویژدانی ئەوروپیدا، لە ئەفسانەی (پرۆمیثیوسی)ی ئاگر دزدا هەیە؟[2]

جا ئەگەر ئەوروپاش بەهەر هۆکارێك بێ بروای بە ئاژەڵێتی مرۆڤ هێنابێ، ئایا رۆژهەڵات بە رۆحانیەتە رەسەنەکەی و بیروباوەڕە رەگاژۆکەی و رەسەنایەتی لە

---

١ خاوە: سەرانە، الإتاوة.

٢ ئەمە ئەفسانەیەکی یۆنانی کۆنە ململانێی نێوان مرۆڤ و خواوەندان لەسەر ئاگری پیرۆز (زانین) دەردەخا. مرۆڤ ئاگریان دزی و خواوەندان لەپای ئەوەدا زۆر ئەشکەنجەی بە ئازاریان دان. لەگەڵ ئەوەی ئەمە ئەفسانەیەکی بتپەرستی بو بەڵام لە نەست (لاشعور)ی ئەوروپیدا بەقوڵی رەگی داکوتا و هەستی راستەقینەی ئەوانی بەرامبەر خوا رێکخست، جا پەیوەندی لێکدورکەوتنەوە و پێکدادان، نەك پەیوەندی خۆشەویستی

مەیدانی مرۆڤایەتی، ڕەسەنایەتیەك كە بۆ دەیان هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. هەر لەو ساتەڕا كە ئاینی حەنیفی ئیبراهیم پێغەمبەر تیایدا پرشنگی دا.. ئایا ڕۆژهەلات ڕۆژێك لە ڕۆژان -لەهەر قۆناغێكی تەمەنی- دەتوانێ بەراستی بڕوا بە ئازەڵێتی مرۆڤ بێنێ؟

ئەگەر ئەوروپاش لە فەلسەفەیەكی میسالی هەڵواسراو لە بۆشاییدا یا سوڕاو لە بەتاڵی چوو بەرەو فەلسەفەیەكی ماددی تەواو كە تەنیا بڕوای بەوشتانە هەیە كە هەستەكانی پەی پێدەبەن، وەكو كاردانەوەیەكی لۆژیكی لەگەڵ ئەو ڕوداوانەی لەوێ لە ئارادان، وەكو كاردانەوەیەك بۆ ئەو بارە زەمینیە گەندەڵانەی كە فەلسەفەی میسالی بەجێی هێشت بۆگەنی بێ و كرم لێی بدا، كە بە خۆی لە بورجە عاجیەكەیدا بەدوای لای ئەودیوی مادە و ئەودیوی سروشتدا دەگەڕا.. ئایا لە مێژوی ئیسلامیدا ئەو ڕوبەڕوبونەوەیە دژە لە نێوان میسالی و ماددی، لە نێوان گیانی و جەستەیی، لەنێوان بینراو و نەبینراو ڕویداوە؟ یان ئەو دو توخمە هەر لە سەرەتاوە لە بیری ئیسلامیدا تێكەڵ بون، جا خەڵك لە زەویدا ژیان و ڕوی دڵیان لە ئاسمان بو، كاریان دەكرد و جیهادیان دەكرد و خاكیان ئاوەدان دەكردەوە و فێردەبون و زانستیان هەڵدەهێنجا و دەیانخوارد و ژنیان دەخواست و هەمو داخوازیەكانی زەویان بەجێگیری و باڵا دەستی بەجێدەگەیاند و، لە هەمانكاتدا دڵیان بە خوداوە پەیوەست بو و چاویان لە ڕەزامەندی وی بو، حیسابی قیامەتیان دەكرد و پشكی خۆیان لە دنیادا لەبیر نەدەكرد؟

ئایا چ جار لە ژیانی ئێمەدا ڕویداوە كارگەكان لەو كارگەرانەی كە دژی ستەمكاری ڕاپەڕیون بكەونە فێڵ كردن و ژنانیان لەباتی بخەنە كار، پاشان نیوەی كرێی پیاوانیش بدەنە ژنان هەروەك لە ئەوروپا ڕویدا، جا ژن ڕاستبنەوە و داوای

یەکسانی کرێیەکانیان بکەن[1]؟ یان ئایا لە تێکڕای مێژوی ئێمەدا رویداوە نیوەکرێی شایستە بدەینە ژن -چونکە ژن- لەپای ئەو رەنج و زەحمەت و کارەی لەکارگەیەك یا کۆگایەکی بازرگانی یا لە کێڵگان دەیدا، ئایا لە مێژوی کۆن و نوێی ئێمەدا رویداوە بۆ نمونە موچەیەکی کەمتر لە مامۆستای پیاو بدەینە مامۆستا ژنەکان هەروەك تا ئەم ساتەش لە ئینگلترا رو دەدا، بەبیانوی ئەوەی ژن مۆڵەتی زگپڕی و منداڵبون و شیرپێدان وەردەگرێ بەڵام پیاو ئەو جۆرە مۆڵەتەی نیە؟ وە ئایا ئەم جۆرە شتە بچوکانە لە روی بایەخە مرۆڤانەکە راوەستاوە کە هەمو دەم هەستی رۆژهەڵات لەم بابەتەوە پرشنگ دەدا؟

ئایا هیچ شەڕێکی کاولکار لەلای ئێمە رویداوە ملیۆنان گەنج و لاوان تەفر و تونا بکات. پاشان ئاینی ئێمە رێ لە پیاوە زیندوەکان بگرێ پتر لە ژنێك بێنن، جا کچان لە پشکە پاکەکەی خۆیان لە پارێزگاری و چاودێری و پێداویستی جنسی بێبەش بن و، لەژێر فشاری ئەم پێداویستیە خۆیان بدۆڕێنن؟

ئایا لای ئێمە هیچ پازدانێکی لەناکاو لە کشتوکاڵەوە بۆ پیشەسازی رویداوە، کە کارگەران لە گوندان بۆ شار راپێچ بکا بە بێنەوەی دەرفەتی ئارامگرتن و گواستنەوەی خێزان و سەقامگیربونیان بۆ برەخسێ. کە ئەمەش ببێتە مایەی گەندەڵ بونی کچ و کوڕانی گەنجی شار؟

یان چیدیکە؟!

لەم هەموە چی بەدرێژایی مێژوی ئێمە رویداوە کە ببێتە هۆی (مەنتیقی) لێکدابڕان و توانەوە؟

---

١ تەنیا لە میرات دا ژن نیوەی پیاو دەبا، ئەویش ماڵێکە ژن پێیەوە ماندو نەبوەو حیکمەتی دابەشکردنەکەش لەوەدایە کە پیاو لەو میراتەیدا ئەرکی مەسرەفی خێزانی دەکەوێتە سەر نەك ژن. بەڵام کرێی ئیش و کار پەیوەندی بەو رێنماییە نیە کە بە میرات تایبەتە.

ئایا هیچ رویدا؟ له ئیمپریالیزمی ئەوروپی بۆ رۆژهەلات زیاتر چیدیکه رویدا.. ئەو ئیمپریالیزمەی تەنیا بە لەشکری سەربازی خاکی داگیر نەکرد. بەلکو دلّ و گیانەکان و هەست و هزرەکانیشی داگیرکرد؟

باراشکاوبین و.. با بلّێین ئێمە لاسای رۆژئاوای داگیرکەر دەکەینەوە وەك لاساکردنەوەی کۆیلە یا لاساکردنەوەی مەیمونان.

❋ ❋ ❋

ئێمە -میللەت و، نوسەر و هزرمەندان- هیچ بیرۆکەیەکی ئاشکرامان هەیە لە بارەی ئەو کۆمەلگەیەی دەمانەوێ؟ کە بیر و هەست و رەوشت و نەریتەکانی چین؟ ئایا بیرۆکەیەکی ئاشکرامان لە بارەی هیچ نەریتگەلێك هەیە کە کامەی دەبێ بمێنێتەوە و کامەی دەبێ لابچێ..؟

ئایا هیچ بیرۆکەیەکمان لە بارەی ئەو وێنەیە هەیە کە کچ و کوڕانی لاومان دەبێ وەریگرن؟ لە (ئازادیەکەیان) تا کوێ بڕۆن و چ ڕێکخەرێك[1] بیانگرێتەوە؟ یا هەر یەکجاری هیچ ڕێکخەرێك لە ئارادا نیە؟..

ئایا کچ بەهەمو ڕاڕەوێکدا بڕوا؟ ئایا بۆ خۆی هاوڕێیەکی هەبێ؟ ئایا (باسی) ئەو هاوڕێیەی لەلای خێزانیدا بکات؟ یا هەر بەنهێنی پەیوەندی لەگەلّیدا هەبێ؟ ئایا پێویستە خێزانەکەی کە دەزانێ توڕەبێ؟ یا دەبێ چاوی لێ بپۆشێ وەك ئەوەی نەیزانێ؟ یا بەرویەکی خۆشەوە پێشوازی لە هاوڕێکەی دەکات؟

ئایا کچ لەگەلّ دەسگیرانەکەی بەتەنیا دەچنە سینەما و شانۆ و باخچەیەکی چۆلّ. یا دەچنە شوێنێکی کەسنەزان؟ یان کەسێکیان لە خێزاندا لەگەلّ دەچی؟ ئایا دەبێ ئەرکی ئەو کەسەش چ بێ؟

---

[1] ڕێکخەر: ضابط

ئایا بە کراسێکەوە دەردەچێ کە بەدڵی خـۆی بـێ؟ قومـاش و بڕیارەکـەی بـە کەیفی خۆی هەڵدەبژێری، کە سینگی روت یا پشتی روت یا قاچـەکانی روت بـێ؟ یا خێزان سەرپەرشتی دەکا یا ئەو هەڵیدەبژێرێ؟

یا کە دەچێتە دەرێ لێی دەپرسن: کێوە دەچـی؟ یـان ئەمـە لـەو تایبەتیانـەی خۆیەتی کە خێزان نابێ تێکەڵیان بێ؟

ئایا لە دورەوە یا لە نێزیکدا چاودێری دەکرێ یا جڵەوی دەدرێتە دەست خۆی؟

ئایا ئەگەر درەنگ گەڕاوە لێی دەپرسرێ: لە کوێ بوی؟

یا ئەوە مافێکی خۆیەتی و تیایدا ئازادە؟

ئایا ئەگەر گوتی: لەگەڵ دەستە خوشکێکم دەخوێنند، دەبێتـە شـتێکی بەڵگـە نەویست یا گفتوگۆی لە بارەوە دەکرێ؟

ئایا گفتوگۆکە بە چ شێوازێك دەبێ؟ بەچاوپۆشی لێکردن و فرتوفێڵ؟

یا بە تێکگەیشتنێکی راشکاوانە؟ یا بە گەفو گوڕ بەناوی دەسـەڵاتی خـێزان و دەسەڵاتی سزادان؟

ئایا -ئەگەر بارودۆخی ئابوری نەبوە رێگر- تا کوێ دەخوێنێ و چی دەخوێنێ؟

ئایا ئامانجیش لە خوێندنەکە چیـە؟ وەزیفەیـەك تـەنیا چونکـە وەزیفەیـە؟ یـا وەزیفە بۆ مێرد پەیداکردن؟ یا وەزیفە بۆ هەستکردن بە ئازادی؟

لەلایەکی دیکەوە: ئایا کوڕ بەهەمو راڕەوێکدا دەڕوا؟

ئایا لەکیژان دۆستێك دەگرێ و هەمو داخوازیە جنسیەکانی پێ جێبەجێ دەکا، یا هەر هەندێکیان بەپێی ئاسانکاریەکان؟ ئایا ئەمە لەبەر چـاوی خـێزان و لەبـەر چاوی هەموان بەئاشکرایی دەبێ؟ یا بەدزی و بە نهێنی دەبێ؟ یا هەڵوێستی خێزان

چ دەبێ کە دەزانێ؟ ئایا ئەو کاتە بەچ جۆرێك ئاراستە دەکرێ؟ یا هەر بەیەکجاری ئاراستە ناکرێ؟

ئایا هەڵوێستی کوڕ لەناو خێزاندا بەرامبەر باوکی چیە؟

ئایا ڕێزی دەگرێ بەواتای جێبەجێکردنی فەرمانەکانی، یا لەسەر بنچینەی (هاوڕێیەتی) ڕەها لەهەمو مەسەلەیەکدا ڕێزی لێدەگرێ؟ یا ڕیزی ناگرێ؟ یان هەڵوێستەکەی لە بەرامبەریدا بێلایەن دەبێ نە سوکایەتی پێدەکا و نەڕێزی دەگرێ؟

ئایا کوڕە بۆ خۆی داخوازی دەکا، یا بەهۆی کەسانێکی دیکەوە؟

ئایا کێ دەخوازێ؟ کچێك دەخوازێ کە لەرێگە یا سینەما یا لە باخچەیەکی گشتی ئاسیویەتی؟ یا کچێك کە لە ئیش لەگەڵیدایە یا لە خوێندنێ پێکەوەن؟ یا کچێك کە هەر نەیناسێ؟

ئایا مەرجەکانی لە ژنەکەیدا چین و؟ چۆن دەزانێ کە هەمو مەرجەکانی تێدایە؟ ئایا هاوەڵ و هاوڕێیەتی دەکا و چی ڕێکەوێ لەگەڵیدا دەکا، ئەوجا ئەگەر پێی ڕازی بو دەچێتە داخوازی؟ ئایا هەر (بە بێگوناهی) لەگەڵیدا دەبێ و؟ ئایا ڕادەی بێگوناهیەکەی چەندە؟ ئایا ماچ و لە باوەشگرن دەکەونە چوارچێوەی بێگوناهی یا چوارچێوەی گەندەڵی؟ ئایا هەڵوێستی چ دەبێ کە دەزانێ -پێش ئەوەی ببێتە دۆستی تایبەتی ئەم- پێشتر دۆستی فلان و فیسار بوە و، ئێستا چی لەگەڵ ئەمیان دەکا ئاواشی لەگەڵ ئەواندا کردوە؟ ئایا ئەمە وەك ئەمری واقیع وەردەگرێ، یا سەری خۆی لە قومەلانێ دەشارێتەوە، یا هەڵدەچێ و توڕە دەبێ؟ وە ئایا چۆن (خۆشەویستی کچە) بۆ خۆی تاقیدەکاتەوە؟ ئایا ئەو کاتە بەخۆشەویستی دادەنێ کە خۆی دەداتە دەست یا کە نایەڵێ؟ ئایا تا چ ڕادەیەك دەوروخولی دەدا کە بە ئەمایە ببێتە ژنی؟ ئەو کاتە ڕای چدەبێ کە کیژە بۆی دەستەمۆ دەبێ؟

ئەدی پاش زەماوەندکردن؟ هاورێ و دۆستانی پێشو چییان لێدێ؟ ئایا کوڕە واز لە دۆستانی خۆی کچەش واز لە هاوڕێکانی دێنێ؟ یا کوڕە رێ لە ژنەکەی دەگـرێ و بەخۆی وازناهێنێ؟ یا -پێکەوە- لە بۆنە و کۆبونەوان چاویان پێیان دەکەوێ؟

وە ئایا ژنە لە ماڵێ پێشوازی لە برادەرانی مێردی دەکا؟ ئەگەر کابرا لەوێ بـێ یا لەوێ نەبێ هەر پێشوازیان لێدەکا؟ یا تەنیا لەو کاتەی کە مـێردە لـە ماڵێیـە؟ ئایا چ دەستەبەری[1] دەکا؟

ئەمانە و سەدان و هەزارانی هاوشێوە.. ئایا ئێمە -ئێمەی میللەت و، نوسەر و هزرمەندان- بیرۆکەیەکی دیار و ئامانجێکی بەرچاومان هەیـە؟ یـا مەسـەلەکە بـە (بەرەکەت) و بۆ بارودۆخ چۆنی هات ئاوا لێیدەگەڕێین؟

با راشکاو بین و.. با بڵێین ئێمە هێشتا هیچ بیرۆکەیەکی دیار و ئاشکرامان نیە و، بەبێ ئامانجێکی دیاریکراو دەژین.

* * *

ئایا ئێمە گەلێکی پارێزگارین؟ یا ئێمە گەلێکی ئازادین؟ یا نەئەوین و نە ئەم؟

ئایا هیچ توێژێکی کۆمەڵ هەیە -هەر توێژێك بێ- نـەریتی ئاشـکرا و وێنـەی دیاریکراوی هەبێ؟ دەشت یا شار کرێکار یا فەرمانبەر. فەرمانبـەری بچـوك یـان فەرمانبەری گەورە، کچی خوێندەوار یان نەزان. کچی فەرمانبەر یا بێکـار. مـێرد کردو یا عازەب. ئەوەی لە (ئەوروپا)ی خوێندوە یا ئەوەی لە میسـری[2] خوێنـدوە. ئەوەی رۆشنبیریەکی (رۆژئاوایی) هەی یا رۆژهەڵاتی؟

---

١ دەستەبەری: ضمان

٢ کە لێرە و لە شوێنانی دیکە نوسەر دەڵێ میسر، لەبەر ئەوەیە کە خۆی خەڵکی ئەوێیە، دەنا مەبەستەکە بۆ ئێرە و هەمو وڵاتانی خۆرهەڵاتی ئیسلامی ڕاستە.. -وەرگێڕ-

ئایا هیچ چین و توێژێك لەوانە یـەك وێنـەی هەیـە کـە مۆرکێکـی دیـاریکراو جودای بکاتەوە؟

یا هەر توێژێك لە هەمو جۆرەکانی تێدایە: میانەڕەو و توندڕەو و بەرەڵلا؟

لە لایەنێکی دیکەش: ئەگەر هەر جۆرە نـەریتێکمان وەرگـرت: توندڕەوی یـان میانەڕەوی یا بەرەڵلایی، ئایا ئەوە توێژێکی کۆمەلایـەتی دیـاریکراو دەگرێتـەوە؟ یان بەبێ هودە لە نێو توێژەکانی کۆمەڵدا پەرش و بلاودەبێ؟

ئەگەر بۆ نمونە ئەوەمان وەرگرت کە کچ بەبێ چاودێری بەتـەنیا بچێتـە دەرێ.. ئایا ئەمە بەزۆری لە توێژێکی دیاریکراو لە توێژەکانی کۆمەڵگا رودەدات؟

بۆ نمونە لەنێو (رۆشنبیران)؟ یا لـەنێو دانیشـتوانی پایتـەخت؟ یـا لـەنێو ئـەو خێزانانەی کچەکانیان لە زانکۆیان خوێندوە؟ یا لە خـێزانی (هەبونـەکان)؟ یـا لـە ژینگەی کرێکاران..؟

یا ئەم نەریتە لەهەمو چین و هەمو جۆر و هەمو توێژێکیدا[1] دەبینین؟

ئەگەر نمونەی کچێکی پارێزگاریشمان وەرگرت کە غـەریبان نـەدوێنێ و لەگـەڵ پیاوان تێکەڵ نەبێ ئایا زیاتر ئەوە لە (کیژی لادێ)[2]دا دەبینین؟ یا لـەو خێزانانـەی رۆشنبیری ئاینیان هەیە؟ یا لە (چینی ناوەنجی)[3] یا لەهەر توێژێکـی خـەڵکی؟ یـا لێرە و لەوێ بە پەرتوبلاوی دەیبینین لەسەر بنچینەیەکی تێنەگەیشتراو؟

---

١ چین: طبقة. توێژ: قطاع.

٢ کیژی لادێ: بنت البلد.

٣ چینی ناوەنجی: الطبقة المتوسطة.

ئەگەر باوکێك وەربگرین کە پارێزگاری لە کچەکانی دەکا.. یا باوکێك کـە لـە بازارِ هـەڵیاندەخا.. یـا بـاوکێك کـە تێکـەڵی هیـچ نابـێ.. ئایـا لـە توێژێکـی دیاریکراودا دەیبینین، یا بە دابەشکراوی بەبێ سیستەم؟

با راشکاو بین و.. با بڵێین ئێمە لەم مەسەلەیەدا (میللەت) نین بـەڵکو حاڵـەتی تاکەکەسی پەرتەوازەین کە یەکێتیەکی لـێ پێکنایـێ و مۆرکێکـی جیاکـەرەوە و ئاراستەیەکی دیاری نیە.

❋ ❋ ❋

کچ دەچێتە سەر دەریا، روتە و لە مایۆیەك بترازێ هیچی دیکەی لەبەر نیە، بە لەنجـە و لار و خۆبـادانی هـەرچی داپۆشـراوە دەری دەخـا و هەرشـتێکی بـورووژێ دەیورووژێنێ.. دەڵێ بۆ وەرزشکردن دەچێ! (ئای خەڵکینە)! ئێوە هێنـدە دڵڕەقـن و خۆپەسەندن بەشێوەیەك مافی سروشتی وەرزشکردنی لـــێ حـەرام دەکـەن؟ ئـەدی دەریا تەنیا بۆ ئێوەیە ئەی گەلی پیاوان؟ ئایا سروشت تەنیا بـۆ رابواردنـی پیـاوان وەدیهێنراوە؟ ئایا وەرزشیش لە خودی خۆیدا حەرامە؟

نەخێر! مافی خۆیەتی وەرزش بکا. مافی خۆیەتی بچێتـە سـەر دەریـا. مـافی خۆیەتی مەلەی تێدا بکا.. بەروتی لە مایۆیـەك بـترازێ و. پاشـانیش لـە سـەر لم راکشێ و خۆی بداتە رۆژێ.

ئایا ئەمەی مەبەست نیە؟ یا شتێکی دیکەی مەبەستە؟

رێگەی ئەم وەرزشە و، هەمو وەرزشێکی دیکەی دەدەین..

شوێن و گەرماوێکی تایبەت بە پیاوان و، یەکێکی تایبەت بە خانمان دادەنێین.

خودایا! چ رویدا؟ ئەو کیژۆڵەیە بۆ وا هـەڵچو؟ هـەزار کچـی دیکەشـی لەگـەڵ هەڵچون؟ ئەدی داوای وەرزشی نەدەکرد، ئێمەش وەرزشمان بۆ نەرەخساند؟

با راشكاوبين.. ئەو كچە تەنيا خودى وەرزشى ناوێ، يا وەرزشى بەپاكى نـاوێ، بەڵكو دەيەوێ خۆى دەربخا و، چێژ لەخۆ دەرخستنەكە وەرگـرێ و، ئـارەزوى كـوڕە لاوان ببزوێنێ.

* * *

ئەو كچەى كە كراسێكى سينگ روت و بنبـاڵ روت (جـاپۆنيز) لەبـەر دەكـا و بەرێگادا دەڕوا يا لە ئوتومبێل دادەنيشێ يان لە (گازينو) دادەنيشێ لەنێو پيـاوان و گەنجاندا.. دەڵێ كەوا مومارەسەى (ئازادى) خـۆى دەكـا لـە هـەڵبژاردنى ئـەو پۆشاكانەى خۆى دەيەوێ. ئەو كچێكى ئازاديخوازە و، قەوارەى ئازاديخوازانەى خۆى وەديدێنێ. خەڵكينە ئێوە چيتان لێى داوە؟ ئێوە بەگوێرەى ئـەو كێـن؟ بـۆ تێكـەڵ كاروبارى دەبن؟ پەيوەنديتان پێيەوە چيە و چ مافێكتـــان بەسـەريەوە هەيـە؟ ئـەو ئازادە چى بيەوێ بەخۆى بكا.. ئايا ئێوە رێ لە ئازادى ژن دەگرن؟ ئايـــا قـەوارەى سەربەخۆى ژن رەشدەكەنەوە؟ ئايا دەيكەنە كۆيلەى خۆتان؟ ئايا دەيكەنە پاشـكۆى پياو تا ئـەو جلـە بپۆشـێ كـە پيـاو بەسـەريدا فـەرزدەكا و بۆخـۆى چـى بيـەوێ هەڵيـنابژێرێ؟

نەخێر. ژن ناكەينە كۆيلە و نايكەينە شوێنكەوتە و پاشكۆى پياو.

ژن قەوارەيەكى (ئازاد)ى هەيە.

بەلاّم.. ئايا مەبەستى راستەقينەى ئازاديە؟

ئايا ئەمە (دۆز)يكى دەرونى و رۆحى و هزريە كە باوەڕى پێدێنێ و وەديدێنێ؟

با تەماشەكەين..

ئەو كوڕە لاوەى كە سينگە روتەكەى ئارەزوى ئاژەلاّنەى تێدا وروژاند.. كە وەك هار چاو دەبڕێتە ئەوەى ديارە و ئەوەى داپۆشراوە.. ئەو گەنجـەى خەريكـە بـەچاوە

برسیەکانی هەڵیلوشێ.. ئایا کچەکە وا نابینێ؟ ئایا رای بەرامبەری چۆنە؟ هەر چەند بە ڕواڵەت بێزاری دەردەبڕێ، ئایا رای بەرامبەر بە تێڕوانینەکانی چیە؟ ئایا چ حیسابی بۆ نەکردوە؟ ئایا حیسابی بۆ سینگی روت و جوڵانەوەی وروژێنەر و چاوتێبڕینی روتانەی خۆی دەکات کە ئارەزوی ئاژەڵانەی ئەو گەنجە دەوروژێنێ؟ بۆ ئایا تەواو لەمە دڵنیا نیە، هەر لەو ساتەوە کە بۆ دەرچونێ لەبەری کردوە؟ ئایا را و بۆچونی چیە؟ ئایا ئەو کراسەی (بۆخۆی) پۆشیوە؟ یا بۆ ئەو لاوە برسیەی، کە چاوی دەکەوێتە سەر ئەو دیمەنە وروژێنەرە؟ بۆچی؟ بۆچی حیساب بۆ ئەو لاوە دەکات کاتێکی کراسەکە دەپۆشێ و، کە بەرامبەری دادەنیشێ حیسابی بۆ دەکا لەو ساتەی چاوی دەکەوێتە سەر؟ ئایا بۆیە حیسابی بۆ دەکا چونکە کچێکی ئازادیخوازە؟ یا لەبەر ئەوەی لە ناوەوە بۆتە کۆیلەی هاندەری سێکس، بۆتە کۆیلەی ئەو ئاژەڵەی لە خۆیدایە و ئەو ئاژەڵەی لە کوڕەکەدا هەیە؟

با راشکاوبین.. ئەو کچە موماەرسەی (ئازادی) ناکا بەڵکو موماەرسەی کۆیلایەتیەکی تەواو بۆ هاندەرە ئاژەڵانەکە دەکا.

* * *

ئەو رۆژنامەنوسەی کچان لە رۆژنامەکەیدا بەکاردێنێ.. دەڵێ: کار بۆ (ئازادی) ژن دەکا. یارمەتی دەدا هەتا (بخزێتە) ناو هەمو بوارێکی کارکردن و شایستەیی خۆی بسەلمێنێ و کەسێتی خۆی وەدیبێنێ. دەڵێ ژن سەلماندی کە لە پیاو لێهاتوترە و زیاتر تواناى بەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکانیدا دەشکێ. دەڵێ: ژن ئارامی‌زیاترە لەسەر کارەکەی و دڵسۆزی زیاترە.. دەڵێ و دەڵێ..

ئایا بەراستی بۆ ئازادکردنی ژن و سەلماندنی شایستەیی کاردەکا؟

یا دەیکاتە (تەڵە)یەك بۆ ئەو کارە رۆژنامەوانیەی ئەنجامی دەدا؟ دەینێرێ بۆ وەرگرتنی هەواڵان و، چاکیش دەزانێ کە جوڵەیەکی نەرم و شل لێرە و

زەردەخەنەیەکی وروژێنەر لەوێ دەمــە داخراوەکــان دەکاتــەوە و رازی نێـو سـینان دەردەهێنێ. یا لە نوسینگەکان دەیهێڵێتەوە جا لاوان باڵەفڕکێی لە دەور دەکــەن و لە کارکردن بۆ رۆژنامەکە (دڵسۆز) دەبن هەتا لە پاڵ کچەکەدا بمێننەوە؟

ئایا ئەو خاوەن رۆژنامەیەی کار دەداتە کچان پەی بەمە دەبا یا لێی بێئاگایە؟

با راشکاوبین.. ئەمە بازرگانیەکە وەك بازرگانی کۆیلەی سپی پێستە لـە پشـت دیواران و لەپێش دیواران رودەدا.

* * *

ئەو نوسەرانەی بانگەوازی (ئـازادی) دەکـەن و.. ئـەو لاوانـەی بـۆ کتێبەکـەی هەناسەگیر دەبن.

ئایا ئەوانە لە بانگەوازی ئازادیدا دڵسۆزن؟ ئایا بەراسـتی لـەتاو پاشـکەوتن و کۆیلایەتی ژن ژان گرتونی؟ ئایا ویژدانیان لەتاو ژنانی ئازاردراوی سەر زەوی چکـی کردوە و چاویان بە فرمێسك تەڕبوە؟

ئایا بەراستی دەیانەوێ ژن هەست بە کەسێتی خـۆی بکـات و قـەوارەی خـۆی وەدیبێنێ؟

ئایا هەریەکەیان دەیەوێ ژنێکی (ئازاد)ی هەبێ لەوانەی کە بەخۆی لە خـەیاڵی خۆیدا لەکاتی بانگەوازەکەی وێنەیان دەکێشێ.. ژنێك حیســاب و کیتـاب لەگـەڵ مێردەکەی بکات و بیخاتە بەر ئەو هەستەی کە لەگەڵیدا یەکسانە، پیـاوە کـارێك ئەنجام نەدا بە رەزامەندی وی نەبێ.. ژنێك هەر کاتێك بیەوێ بچێتە دەرێ و کــەی بیەوێ بگەڕێتەوە و، لە هەمو بوارێکدا لەگەڵ پیاوان تێکەڵ بێ؟

یا لە دەست ئەو ژنە پشی تەنگ دەبێ و نــەفرەت لـەو رۆژە دەکـا کـە تیـایدا (ئازاد) بو.. لەگەڵ ئەوەش هەر بانگەوازەکە دەکا..

ئایا لە بانگەوازەکەیدا دڵسۆزە؟ یا (هاندەرێ) لەدوا هەن؟

ئایا ئازادی ژنی دەوێ تا بەڕاستی ئازاد بێ..

یا بۆ ئەوەیەتی تا بە ئاسانی لە بازاڕ و کارگە و نوسینگە و ڕێگادا دەسکەوێ؟ هەتا بە سانایی ئارەزووەکانی تێرکا و هیچ لەمپەرێکی لەڕێگەدا نەبێ و هیچ (نەریت)ێك ڕێگەی نەگرێ؟

با ڕاشکاوبین.. ئەوە ئارەزوی دەسکەوتنی ئافرەتە نەك خولیای ئازادکردن.

* * *

ئەو کچەی دەچێتە زانکۆ و وەك سەماکەر خۆی ڕازاندۆتەوە و وەك ... خۆی روتکردۆتەوە.

دەڵێ: گوایە زانستی دەوێ..

بەو شێوەیە؟...!

زانست ئەو جلوبەرگانە دەخوازێ؟ زانست ئەو جوڵە و خۆبادانەی دەخوازێ؟

زانست پێکەنینی وروژێنەر و چاوتێبڕینی پڕ غەمزە و فریودانی دەوێ؟

زانست نینۆکی بۆیاغکراو و سۆراوی لێوانی دەوێ؟

زانست وادەخوازێ لەماوەی نێوان موحازەرە یا لە کاتی موحازەرە (لێدان) لەگەڵ خوێندکاران لەنادی دانیشێ؟

زانست ژوانی پەناوپەسیوانی دەوێ بەبیانوی خوێندن.. چ خوێندنیش لە گۆڕێ نیە؟

زانست چاوچاوانێ لەگەڵ مامۆستا و سەرنج ڕاکێشانی موعیدانی دەوێ؟

زانست وادەخوازێ زانکۆ بکرێتە سەماگە و شانۆ و کەرنەڤاڵ؟

ئایا ئەو کیژە کە لە ماڵێ دێتە دەر زانستی لەبیرە؟ یا بۆ (ڕاوکردن) چۆتە زانکۆ؟

با ڕاشکاوبین..

* * *

زانکۆکان ئەمڕۆ بون بە چوار.. دوانیان لە قاهیرەدان[1]

کاتێك هەندێك کچی (دواکەوتو) کە بۆ زانست دەچنە زانکۆ و، دڵیان لەو پیسوپۆخڵیە روحی و فیکریە هەڵدەچێ کە ئەو کیژ و کورە خوێندکارانە مومارەسەی دەکەن لە راو بترازێ خەمێکی دیکەیان نیە.. راوکردنی ئاژەڵ..

کاتێك ئەو کچانە داوایانکرد زانکۆیەکیان بۆ تایبەت بکرێ، تا دور لە گەندەڵی هەمو زانستێکی تێدا فێر بن، ئەوا رۆژنامەوانی (ئازادیخواز) هار و هاج بو و.. گوتیان تاقیگە و کارگە لە کوێ بێنین و مادده لەکوێ بێنین؟ تەنانەت مامۆستا و وانەبێژ لەکوێ بێنین کە ئێمە بەخۆمان دەستمان ناکەون و بۆیان لە تەنگژە داین.

ئەمڕۆ.. ئەگەر کچانی هەر چوار زانکۆ کۆ بکەینەوە؟ ئایا زانکۆیەکی تەواو بەڵکو زیاتر پڕناکەنەوە؟ بەهەمان تاقیگە و کارگە و بەهەمان مادده و، هەمان مامۆستا و وانەبێژ، بەبێ زیادکردن و گۆڕانکاری؟

با ڕاشکاوبین.. مەسەلەی لە دەستهاتن نیە، بەڵکو حەزێکی شێتی تێکەڵبونە.

* * *

---

[1] ئاشکرایە نمونەکانی ئەم کتێبە بەگشتی و ئەم بەشە بەتایبەتی هەموی لە واقیعی میسرەوەیە، بەڵام ئەمانە تەنیا نمونەن دەنا مەبەستەکان بەسەر هەمو واقعێکدا پیادە دەبن. –وەرگێڕ–

ئەو برایەی خوشکەکەی (بەرەڵا) دەکا تا دۆست و گراوی بۆ بگرێ..

ئایا بۆ بازنەی خەیاڵی تەواو ناکا تا ئەو شتە بزانێ کە هەر دەبێ ڕوبدا؟

ئایا نازانێ چ نمونەو پێشەنگێك دەداتە خوشکەکەی کاتێك وەکو بەکاری دێنێ تا کچی بۆ بێنێ؟ ئایا نازانێ کە خوشکەکەی دەزانێ بۆچی کچ لە دوای کچی لێ داوا دەکا؟ ئایا نازانێ خوشکی دەرك بەوە دەکا کە بەم شێوەیە ئارەزوەکانی براکەی تێر دەکا؟ ئایا نازانێ کە چ پێشەنگ و نمونەیەکی دەداتێ و هەر دەبێ ئەویش بۆ خۆی لە هاوڕێیەك بگەڕێ، یا لەنێو هاوڕێیانی براکەی، یا لەهەر ڕێگایەکی دیکە؟

هەڵوێستی چیە؟

ئایا رازیە لەپێناو تێرکردنی ئارەزوی نزمی خۆی خوشکەکەی فێری گەندەڵی بکا و فرێیداتە سەر ڕێ؟

یا پێشوازی لێدەکا. بەڵکو لەکاتی راوی خۆیدا نێچیرێکی باشیش بۆ برایەکەی بدۆزێتەوە.

با راشکاوبین.. ئەمە پیسیەکی قێزەوەنە ئاژەڵی لێ دەپرینگێتەوە.

* * *

ئەو باوکەی درەنگی شەوێ کچەکەی دەگەڕێتەوە و.. پرسیاری لێدەکا و وەڵامی دەداتەوە.. کە لەگەڵ یەکێك لە دەستەخوشکانی دەیخوێند.

ئایا دەزانێ؟ ئایا هەڵدێنێ؟

ئایا دەزانێ ئەو کوڕە لاوەی لەگەڵیدا بو تا دەرگایماڵیی هێناوە و بەیانیش چاوەڕێی بوبو؟

ئایا کە دەزانێ هەڵوێستی چیە؟

كاتێك لە ناوەوە دڵی دەبزوێ بەڵام ملی شۆڕ دەكا و كڕدەبێ و.. وا پیشـاندەدا كە ڕازیە، ئایا وا دەزانێ هێشتا گەردیلەیەك پیاوەتی تێدا ماوە؟

یا ڕەنگە لەبن سمێڵان بزەی بێتێ و، بڵێ: (كچەكەم زیرەكە)!.. دەبێ كەی كوڕی باشێك بێتە خوازبێنی؟

با ڕاشكاوبین.. ئەمە پیسیەكی بێزەوەرە و ئاژەڵ لێی دەپرینگێتەوە.

* * *

سنورەكانی ڕەوشت بەرزی چین؟

كاتێك كچ بەسینگی ڕوت دەچێتە دەرێ و ڕوی سـواخ دراوە و خـۆی بـادەدا.. بانگەشەكارانی (ئازادی) دەقیژێنن! چیتان دەوێ ئـەی توندڕەو و دڵڕەقینـە؟ ئایـا ڕەوشتبەرزی بە جلوبەرگە؟ ئایا بەسەر ڕوی پێستە دەپێورێ؟ بـە سـانتیمەتر و بـە مسقاڵە؟ ئـەوە كیژۆڵەیـەكی بێگوناهـە هیـچ مەبەسـتێكی نیـە. ئـەوە كچێكـی ڕەوشتبەرزە.

كاتێك كە دەبێتە دۆستی كوڕێك و لەگەڵی دەچێتە سـینەما یـا گەشـتێك لـە چۆڵەوانیدا، بانگەشـەكاران هاواردەكـەن و دەڵێـن: جـا (چقەیدیـە)؟ چ ڕویـداوە؟ گەشتێكی بێگوناه لە چۆڵیدا.. ئێوە بێجگە لە شـتی خـراپ چیدیكـەتان بـەدڵدا نایێ؟ خەڵكینە! گومانتان باش بێ. خراپە تەنیا لە خەیاڵی پڕ شتی هیچ و پـوچ و تاریكی و گومانی ئێوەدا هەیە. كـوڕە گەنجـە و دەیـەوێ بـە پـاكی و بێگونـاهی ڕابوێرێ.

كاتێك لە باوەشی دەكـا و مـاچی دەكـا و.. هـەندێك دەسـگەمەی قەدەغـەی لەگەڵدا دەكـات.. بانگەشـەكاران دەقیژێنـن: ئایـا هیـچ ڕویـداوە؟ ڕەوشـتبەرزی دەسكاری كراوە؟ كچە هیچی لـێ كەمبۆتەوە؟ خۆ دنیا بەسەریەكدا نەڕوخاوە؟ هۆ

خەڵکینە! هێشتا دنیا باشە! لێگەڕێن ئیش بڕوا. دۆستایەتیەکی بێگوناح.. دەستبازیەك کە سنور نەبەزێنێ..

ئەو کاتەی کارەساتەکەش رودەدا بانگەشەکاران دەقیژێنن: تاکەی لە بیرکردنەوە و تێڕوانینی روداوەکان هەر پاشکەوتو و کۆنەپەرست دەبن؟ ئایا رەوشتی بەرز شتێکی ماددی بەرهەستە؟! رەوشتبەرزی لە ناخەوەیە! لە دەرونە! لە هەستەکانە! ئەوە کچە خۆشەویستی وێڵی کردوە، بەسەر هەستەکانی دا زاڵبوە و ئەویش هەمو شتێکی لەپێناو کردۆتە (قوربانی). بەڕاستی کچێکی هەست بەرزە. مادام جەستەی خۆی نافرۆشێتە هەمو کڕیارێك. مادام بۆ (خۆشەویستیەکەی) دڵسۆزە و، بۆ دۆستەکەی وەفادارە. کەواتە رەوشتبەرزە!

پاشان جەستەی خۆی دەفرۆشێتە هەمو کڕیارێك و دادەبەزێتە بازاڕ..

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك نوسەرهەن لە دەرونی خۆیان هێشتا زیاتر بێئابڕوییان ماوە و ناوی لێدەنێن داوێنپیسی رەوشتبەرز و! داکۆکی لەو رەوشتبەرزیە دەکەن کە لە داوێنپیسی رەنگدەداتەوە.

با راشکاوبین.. ئێمە بازرگانی (کۆیلە)ین دەمانەوێ داوێنپیسی بڵاوبێتەوە!

* * *

ئەو نوسەرەی ئەم چیرۆکە لە رۆژنامەکەی دەنوسێ:

ژنێك نامەیەکی بۆ ناردوە و (راوێژ)ی پێدەکا و دەڵێ..

وا راهاتبوم ئەگەر کێشەیەك لە نێوان من و مێردەکەم رویدابا دەچومە ژوری خۆم و دەرگەکەم لەسەرخۆم دادەخست.. جا مێردەکەم دەهات و لە دەرگەی دەدا و دەهاتە ژورێ و پێکدەهاتینەوە.

لەدوا جار کێشەیەکی توند ڕویدا و، مێردەکەم زۆر تورە بـو منیـش هەسـتام و چومە ژورەکەم و چاوەڕێ بوم.. وەکو جاران مێردەکەم لە دەرگـەی نـەدا و نـەهات داوای لێبوردنم لێبکا. منیش ڕقم هەستا و، لە ژورەوەڕا دەرگەکەم کلیلدا و، گـوتم ئەگەر هات لەبەر دەرگە دەیهێڵمەوە و بە ئاسـانی لێـی خـۆش نـابم، بـەڵام هـەر نەهات. منیش زیاتر تورە بوم. بەدرێژایی ڕۆژ لە ژورەکەم مامەوە. هـەر نـەهات. دەرگەکـەم کـردەوە. دیتـم مێردەکـەم لـە ماڵـێ دەرچـوە. پـتر ڕقـم هەسـتا.. دراوسێیەکمان هەبو چاوبازی لەگەڵ دەکـردم منیـش چـاوم لـێ دەپۆشـت. بـەڵام ئەمڕۆ هانم دا. هەر تەنیا. هەر تەنیا بۆ ئـەوەی مێردەکـەم تورەکـەم. مێردەکـەم بایەخی پێنەدام. پتر تورە بوم. جا زیاتر دراوسێیەکەم هاندا. بانگی ناو ماڵێم کرد. مێردەکەم گرنگی پێنەدام. هەر یەکجاری شێت بوم. بڕیارم دا لەگـەڵ دراوسـێکەم خیانەت لە مێردەکەم بکەم. کەتنەکەشم کرد.. جا تۆ ڕات چیە؟

ئەو نوسەرەی ئەم چیرۆکە دەنوسێ..

چ مەبەستێکی هەیە؟

بەڕاسـتی مەبەسـتی وایـە گـیروگرفتێك بخاتـە رو؟ بەڕاسـتی دەیـەوێ بگاتـە ئامۆژگاری و پەندێك؟

یان چاك دەزانێ بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکە چ کارەساتێك لە دەرونـی خوێنـەراندا دەقەومێنێ. جا بەهەر چ جۆرێك وەڵامی نامەکەی دابێـتەوە و لەسەری نوسیبێ؟

وە ئایا ئەرکەکەی چیە و؟ ئەرکەکەی لە کۆمەڵگە دا چیە؟ چ ڕۆڵێك دەگێڕێ؟

با ڕاشکاوبین.. ئـەو ڕۆژنامەنوسـە چـاك دەزانـێ بڵاوکردنـەوەی ئـەو چیرۆکـە ئامانجێکی دیکە دەپێکـێ، کـە بریتیـە لـە وروژاندنـی هەسـتەکانی سـێکس و، شلکردنەوەی گرێی ڕەوشت و، هەڵپچڕاندنی چارشێوی ئابڕو بە بڵاوکردنـەوەی ئـەو

كەتنە ناشرینانەی وەك (واقیع)ێك.. واقیعێك خاوەنەكەی بێشەرمانە دەیگێڕێتـەوە.
ئەگەر هەر لە بنەچەڕا خاوەنی هەبێ!

* * *

تێكەڵاوی.. بێگوناح...

لە كوێ هەیە؟ سنورەكانی چین؟ لەكامە گۆشەی سەر ڕوی زەوی مرۆڤ چنگـی دەكەوێ؟

ئایا لەوێ -لەهەر شوێنێكی سەر زەوی- تێكەڵاویەك هەیە ناوی بێگوناح بێ؟

لە گڕی هەست و بزوانی ئارەزوەكان گەڕێ لەناخی دەروناندا. ناو لە تێكـەڵاوی دەنێین بێگوناح مادام جەسـتەی تیـادا بەجەسـتەوە نانوسـێ و جێبـەجێكردنێكی كرداری ئەو شتانەی تیا نابێ كە لـە سـینەدا خـول دەخـۆن. جـا ئـەو تێكەڵاویـە بێگوناحـە لـەكوێ ڕودەدا؟ لـەو ئاهەنگانـەی قوتابخانـەكان بەسەرپەرشـتی سەرپەرشتیاران ئەنجامی دەدەن و؟ لە ماڵان بەسەرپەرشتی باوكان دەگێڕدرێ؟

بەڵێ. ڕاستە. ئەو جۆرە ئاهەنگانە بێگوناح دەبن. چونكـە سەرپەرشـتیاران لـە دیاری ڕادەوەستن و باوكانیش سەیری دەكەن، نـاكرێ لـە تـێڕوانینێكی بێگونـاح و قسەكردنێكی ئاشكرا زیاتر ڕوبدات.

ئاهەنگەكەش كۆتایی دێ و.. كوڕان و كچان دەچنە دەرێ..

بەڵام ئایا سەربردەكە هەر لەم سنورە دیاریكراوە كۆتایی دێ؟

كێیە وا دەڵێ؟

كێیە دەڵێ: پاشان چاوپێكەوتنی تایبەت ڕونادا، كە هەمو شـتێكی قەدەغـەی تێدا ڕودەدا؟

ئەو شێتبونە سێكسیە چیە لە ئەمریكا هەیە و، ئەو بەرەڵڵاییە چیە لە ئەوروپا

لە ئارادایە و، ئەو توانەوەیە چیە کە توانەوەیەکی دیکەی لەدوا نیە؟

ئایا لاوان تێکەڵاوی بێگوناحیان (خواردوە) و، لە سێکس تێربون، ئەوجا لە بەرامبەر تاواندا پاك و پاکیزە بوینە؟

ئەی نرخی تێکەڵاویی بێگوناح چیە ئەگەر مەبەستێکی لەدوا نەبێ و ڕێ لە تاوانێك نەگرێ؟ لە واقیعی ژیاندا نرخی چیە؟

ئەوروپا لەسەدەی ڕابردودا[1] هەڵیبەستا کە گەیشتۆتە ئەو تێکەڵاویە بێگوناحە وەك چارەسەرێك بۆ کێشەی سێکسی خەفەکراو. پاشان بەخۆی ئەنجامەکانی دیت زانی تەنیا چەند هەنگاوێك بەبێگوناحی نامێنێ! ئەوجا بانگەوازکارانیان چیدیکە لە بارەی (تێکەڵاوی بێگوناح) نەیاننوسی. لەگەڵ خۆیاندا ڕاشکاو بون، گوتیان: کەوا ئەوان تێکەڵاوبونیان دەوێ، پاشانیش هەرچی ڕودەدا با ڕوبدا!

ئێمەش تا ئێستا هەر کۆنە قەوانەکە لێدەدەینەوە.. ئەو قەوانەی لەگەڵ خراپ بەکارهێنانی تێکچو!

با ڕاشکاوبین و.. بەڕاشکاوی داوای تێکەڵاوی بکەین، بەهەمو ئەو دەرەنجامانەی دەیداتە دەست و ئەو شوێنەوارانەی بەجێی دێڵێ.

* * *

ئەو چاوە برسیانەی شوێن هەمو کچێك دەکەون کە بە پێشیاندا تێپەڕی و هەر لە تۆقی سەریەوە تا نوکی پێی دەیپشکنن و، بە تێڕوانین هەست بە هەمو کەلەبەرێکی جەستە و هەمو شوێنێکی داپۆشراو دەکەن..

ئەو دەرونە وێڵانەی لە هەڵمی پەتاداری سێکسدا مەلە دەکەن و لە خەونە هارەکانیان وەخەبەر نایەن، هەمو دیمەنێکی وروژێنەر دەقۆزنەوە و، بە هەودای

[1] سەدەی نۆزدە —وەرگێڕ—

هەمو خەیاڵێکی پیس و برسی هەڵدەواسرێن..

ئەو ڕەوە گەنجانەی وەك سەگی هار بەدوای هەمو کچێك دەکەون.

ئایا ئەمانە وەدیهێنراوی ئادەمین؟

ئایا ئەمانە دەرونگەلێکن چاوەڕوانی خێریان لێدەکرێ؟

ئایا ئەمانە قۆڵ و باسکێکن بنیاتی نەتەوە دادەمەزرێنن؟

با ڕاشکاوبین..

***

ئەو کچە نەرم و شل و داشەپاوەی جادەکانی پڕکردوە.. کە لە ڕۆیشتن لەنجە دەکا و لە جوڵانەوەی خۆی دەردەخا و لە قسەکردن ناز دەکا و خۆی ناسك دەکا تاوای لێدێ هەر ئەوەتا دەنگ و پیتەکان گۆ دەکا..

ئەو کچەی بەچاوە گەشەکانی و جولەی جەستەی بەلار و لەنجەی و لۆچی پۆشاکی شەپۆڵداری نزمترین ئارەزوی لاوان لە هەستە سێکسیەکان دەوروژێنێ..

ئەو کچەی بێچاو و ڕویی دەیگەیەنێتە ئاستێك بەخۆی دەست بە غەزەل بکات و، لەماڵ بچێتە دەر هەتا چاوبازی لەگەڵ لاواندا بکات.

ئایا ئەمە وەدیهێنراوێکی ئادەمیە؟

ئایا بۆ ئەوە دەشێ ببێتە دایك و پەروەردەکاری منداڵان؟

ئایا بۆ ئەوە دەست دەدا نەوەیەك دروستکا کە هەوڵدا و لە تێکۆشان ئارامی هەبێ؟

با ڕاشکاوبین..

***

بـا بەحەقیقـەت روبـەڕوی گیروگرفتەکـە ببینـەوە، بـەبێ تـایتڵی خەڵـەتێن و گومڕاکەر.

با بەڕاشکاوی و بە ئازایی چیمان دەوێ بیڵێین..

با بڵێین: ئێمە ئاینمان ناوێ و ڕەوشتمان ناوێ و نەریتەکانمان ناوێ.

بابڵێین: ئێمە دەمانەوێ نەوەیەك خەڵك دەربچوێنین کە وەکو ئاژەڵان بژین.

بابڵێین: ئێمە رقمان لە بەرزبونەوە و لە هەڵکشانە.

بابڵێین و.. نەترسێین.. مادام باوەڕمان بەوە هەیە کە دەیڵێین!

بەڵام خۆپەنادان لەپشت ئازادیخوازی و پێشکەوتن و ڕەهـابون.. ئەمـە هـەموی ساختەیە و هێندەی پێناچێ لادەچێ!

سەیریش نیە ئەوانە هەمو رقیان لە ئیسلامە.. چونکـە کەسـیان نـاوێرن سـەر دەربێنن کاتێك ئێمە موسڵمان بین!

# کاتێک کە موسڵمان بین

کاتێك کـە موسـڵمان بـین بـەبێگومان وێنـەی هـەمو کۆمەڵگـە دەگـۆڕێ و، وێنەیەکی تازە وەردەگرێ.

خەڵکانێکیش لەمە تۆقیون و، دڵانێك ترس دایگرتون!

ئایا دەبێ وێنەی کۆمـەڵگەی موسڵمان چۆن بێ؟

شمشـێر لەسـەر گەردنانـە و، جـەلاد و مـیر غـەزەب رۆژ و شـەو خـەریکی دارکوتکردنی[1] سەرپێچی کارانن!

ژن لە (حەرەمسەرا) دایە و نایەتە دەر و ناخوێنێ و لەکارێك دانامـەزرێ و لـە چالاکیەك بەشداری ناکا!

ردێن بازارەکان پڕ دەکەن و، مێزەر دیوەخانان دەئاخنن!

شادی لەڕو و لە دڵان باری کردووە و، روگرژیەکی هاتۆتە جێ نە زەردەی بەسەر لێو دادێ و نە نەرم دەبێ.

پیاوان لە مزگەوتەکان و ژنـان لـەماڵ، بێدەنگـی و بێجوڵـەیی و رەقهـەڵاتن و بەستەڵەك هەمو لایەکی داگرتوە.[1]

---

١ دارکوتکردن: جلد.

ئەمە وێنەی کۆمەڵگەی موسڵمانە لە زەینی کەسانێکی زۆر!

هەر بۆیە مافی خۆیانە کە لە ترسان بلەرزن و ئەم ئاینە ببوغزێنن!

* * *

کەسانێکی دیکەش رەنگە تا ئەو رادەیە بەدگومان نەبن، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسێن و، رقیان لەم ئاینەیە.

ئەو لاوەی کە بەگەڵ ئارەزوەکانی کەوتوە و جڵەوی لێ هەڵکێشاوە.

ئەو لاوەی لە رابواردنی پیس راهاتوە. کە شەو و رۆژ بێ دڵ دەژی. سێکس خەیاڵی پڕکردوە و، ئارەزوی دەرژێنێتە ناوخوێنی و هار و برسی دەیبزوێنێ.

ئەو لاوەی وێنە روتەکانی گۆڤاران هزرە خەفەبوەکانی وەئاگادێنن، لەگەڵ وێنەی روتی سینەما و، جەستەی روتی سەرشانۆ و،[٢] کچی روتی شەقامەکان و، گۆرانی روتی رادیۆ و، بیرۆکەی روتی نێو کتێب و، چیرۆکی روتی (گەورە) نوسەران.. جا ساچمە شێتە لە خوێنی دەردەپەڕن.

ئەو کچەی وەسفی سێکسی حەزی خەفەبوی بەئاگادێنێ لەهەر رۆژنامە و گۆڤارێکی دەیخوێنێتەوە لەگەڵ دیمەنەکانی رابواردن لە سینەما و شانۆ و، وێنە و قسەی روت ئەندێشەی پڕ دەکەن جا حەز و ئارەزوی هار و هاجی تێدا دەوروژێ.

ئەو گەنجێتیە -بەو حەزە برسی و ئارەزوە چڵێسانە- لەباسی ئیسلام دەڕەوێنەوە و، هەستدەکا مێشێك بە دەمارەکانی وەدەدا، چونکە بەو ساچمە زەنانەی ناو

---

١ بەداخەوە زۆر لەوانەی بانگەشەی ئیسلامی بون دەکەن، زۆرجار دەقاودەق ئەم وێنەیە دەخەنەڕو. -وەرگێڕ-

٢ ئاشکرایە لە دەمی نوسینی ئەم کتێبەدا بەزمی سەتەلایت و کەناڵە ئاسمانیەکان لەگۆڕێ نەبوینە، دەنا ئەوان بەلای گەورەترن. -وەرگێڕ-

خوێنی، خۆی وا دێتە بەرچاو لە هەمو چێژێك بێبەشە کە حەز و ئارەزوی دامرکێنی، بۆیە خولیاکانی شێت دەبن و، ئەم ئیسلامەی وەك دڕندەیەك دێتە بەرچاو کە لەبەردەم هەمو ئارەزو و چێژێك راوەستابێ.

* * *

هی دیکەش هەن لە وێرانکردنی رەوشتبەرزی و بلاوکردنەوەی فاحیشە لە کۆمەڵگەدا سود وەردەگرن، بۆیە زەندەقیان چوە و رقیان لەم ئاینەیە.

خاوەنی رۆژنامە و گۆڤارە روتەمەنیەکان.

خاوەن سینەما و فیلم سازەکان.

نوسەری هزرە روت و داشەپاوەکان.

کۆیلەکانی ئیمپریالیزم.. کە رقی لە ئیسلامە و لە راپەڕینی دەترسێ.. بۆیە بەکرێگیراوانی خۆی تێبەردەدا هەتا لە ناوەوەڕا وێرانی بکەن و، وەك مۆرانە کلۆری بکەن و، وێنەکەی لەبەرچاوان بشێوێنن و.. لەهەمانکات رەوشتنزمی بلاوبکەنەوە تا بۆشاییەکە پڕکاتەوە..

ئەوانە هەمو لە باسی ئیسلام دەتۆقن و ئەم ئاینە دەبوغزێنن، چونکە ئەو زۆنگاوە پاکژ دەکاتەوە کە ئەوان بە سەرکەوتن و قازانجەوە تێیدا دەژین.

* * *

ئێمە ئێستا مەبەستمان ئەم گروپەی سێیەم نیە ئەگەر چی لە هەموانیش ترسناکترە!

بەڵکو مەبەستمان گروپی یەکەم و دووەمە، چونکە کە ئەمان ئیسلام بە حەقیقەتی خۆی دەناسن و بروای پێ دێنن، ئەوا گروپی سێیەم ناتوانێ رێگەیان

لـێ بگرێ، ئەگەر هەمو ڕێچکەیەکیش بگرێتە بەر.

ئەو وێنە شێواوەی ئیسلام لە دەرونی خەڵکیدا، کە ئیمپریـالیزم بـۆ شـێواندنی کۆششی کردوە و، (پیـاوانی ئـاین)یـش بەرەقـەکاری و بـە بـەردبونی خۆیـان بـۆ جێگیربونی ئەم وێنە شێواوە یارمەتیدەر بون.. ئـەم وێنـە شـێواوە ئـەمڕۆ یەکـەم دوژمنی بیری ئیسلامیە.

وێنەی کۆمەڵگەی موسڵمان چۆن دەبێ؟

زۆر لە خودی موسڵمانان، کە بۆ ئەم ئاینە دڵسۆزن، بەوردی نایناسن و، نـازانن چۆن دەبێ.

کێشەی هەرە گەورەش لـە زەینـی خـەڵکدا بریتیـە لـە ڕەوشـی[1] ئـافرەت لـە کۆمەڵگەی موسڵمان و، ئەو ڕۆڵەی کە ئەنجامی دەدا.

ئایا دەردەچێتە سەر شەقام یان لەماڵێ دەمێنێتەوە؟

ئایا دەخوێنێ؟ لە چ ئاست و، لە چ چوارچێوەیەکدا؟

ئایا دەچێتە زانکۆ و خوێندنی هاوبەش دەخوێنێ؟

لە ماوەی خوێندنیدا پەیوەندی لەگەڵ خوێندکـاران چـۆن دەبـێ؟ دەیاندوێنـێ؟ لێیان دور دەکەوێتەوە؟ لە چ جۆرە قسەیەك بەشدارییان دەکا؟

ئایا کار دەکا؟ یان حەڵاڵ نیە کار بکا؟

چۆن مێرد دەکا؟ دەچێتە دەرێ و خۆی دەردەخا هەتا لاوان بیناسن؟ یا لە ماڵێ دەمێنێتەوە هەتا لەخۆڕا ڕێبوارێك دەیدۆزێتەوە؟

---

[1] ڕەوش: وضع.

پەیوەندی لەگەڵ (کۆمەڵگەدا)دا چیە؟ پـەیوەندی تـرس و دورکەوتنەوەیـە؟ یـا پەیوەندیەکی سلبیە و نەدەبەخشـێ و نـە وەردەگـرێ و نـە لـە هیـچ مەسـەلەیەك بەشداری دەکا؟

ئەدی (قەوارە)کەی لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا چیە؟ مرۆڤە؟ یان کۆیلەیـە؟ یـان شتێکی پشتگوێ خراوە و قەوارەی نیە؟

ئایا سنوری مرۆڤایەتیەکەی چەندە و؟ چۆن مومارەسەی دەکا؟ بەدور لە پیـاو؟ یان بە هاوبەشی؟ یا بە رکابەریکردن؟

بەشێوەیەکی دیاریکراو رەوشەکەی بەگوێرەی پیاو چیە؟ هاوڕێیـەتی؟ لەگـەڵێدا یەکسانە؟ پاشکۆیەتی؟ خانم و گەورەیەتی؟

هەروەها چۆن لەگەڵ پیاو مومارەسەی پەیوەندی خۆی دەکا؟ چاوی پێدەکەوێ و لەگەڵی دەبێ و گفتوگۆی لەگەڵ دەکا و هاوەڵایـەتی دەکـا و بەتـەنیا دەیناسـێ و پەیوەندی (تایبەت)ی لەگەڵ دروست دەکا؟ ئایا ئاستی ئەو پەیوەندیە چەندە؟

ئایا وێنەی پیاو لە دەرون و خەیاڵی ژندا چۆنە؟ گورگێکی دڕندەیە و دەبێ خۆی لـێ بپـارێزێ؟ یـا عاشـقێکی سـوتاوە و دەبـێ قبـوڵ بکـرێ؟ یـا هـەر لـە دورڕا موعجەبە؟

ئایا خۆشەویستی بکا؟ ئایـا دڵـی بـۆ پیـاوێکی دیـاریکراو بەسـۆزەوە لێبـدا؟ پاشـان.. ئایـا خۆشەویسـتیەکەی دەرخـا یـا بیشـارێتەوە و؟ بـەچ شـێوەیەك (مومارەسە)ی بکا؟

ئایا ئەگەر پیاوێك هاتە داخـوازی بـە کەسوکاری بڵـێ: نـەخێر. مـن ئەمـەم خۆشناوێ و، فلانم خۆش دەوێ و دەمەوێ؟

ئایا پەیوەندی بەخێزانەکەی چۆنە؟ تاکێکە لەو رەوەیەی[1] خێزانی لێ پێکدێ؟ یا تاکێکە قەوارەی هەیە؟ ئایا سنورەکانی ئەم قەوارەیە چین؟ لەهەمو فەرمان و هەمو ئامۆژگاری و هەمو ئاراستەکردنێك بۆ دایك و باوکی ملکەچ دەبێ؟ یا گفتوگۆ دەکا؟ سنوری گفتوگۆکەش چیە؟

هەروەها ئایا بەبێ بەهانە ملکەچی نەریتەکان دەبێ؟ یا بیانویان لێدەگرێ و؟ تەنیا بەقسە بیانو دەگرێ یا قسەکانیشی جێبەجێ دەکا؟

کاتێك دەبێتە ژنیش ئایا ئەرکەکەی کۆتایی دێ؟ ئایا بۆ دایکایەتی دادەبڕێ و پەیوەندی بە (کۆمەلگە) دەپچڕێ؟ یان دایکایەتی رێگەی چالاکیەکانی لێناگرێ؟ چ جۆرە چالاکیەکیش؟

* * *

ئەمەو دەیان مەسەلەی هاوشێوە یەکەم شتن بەبیری مرۆڤدا رەت بن کاتێك باسی کۆمەلگەی موسلمان دەکا و، وێنەیەکی دیاریکراویش لە خەیالدا دروستدەکرێ بۆ وەلامدانەوەیان، پاشان بابەتەکە وەك شتێکی مەحال بەکۆتا دێ.

پێش ئەوەی وەلامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە و، بەر لەوەی وەلامی پرسیارە بەرامبەرەکانیشیان بدەینەوە، ئەو پرسیارانەی کە بەپیاو تایبەتن لە کۆمەلگەی موسلماندا، لەگەل هەلوێستی لاوی زگورتی[2] لە ئاست گیروگرفتی سێکسیدا.. پێش ئەوەی ئەوکارە بکەین دەبێ یەکەمجار بزانین:

ئیسلام چیە؟...

---

[1] رەوە: گەلە: قطیع.
[2] زگورتی: أعزب.

هەڵەیەکی زۆر زەبەلاح و گەورە هەیە بڕواداران و بێبڕوایان بێ جیاوازی تێیدەکەون کاتێك کە گفتوگۆی مەسەلە لاوەکییەکان دەکەن، هەر بەشێکی بە تەنیا، بە لێکدابڕین و پارچە پارچەکراوی، بێئەوەی یەکەمجار لە وێنەکەدا بیخەنە شوێنی خۆی، تاکو وەڵامە راستەقینەکانی رونبێتەوە و، بتوانرێ لە سیاقە راست و دروستەکەی حوکمی لەسەر بدرێ.

ئێمە کاتێك گفتوگۆی هزرەکانمان کرد لە ئەوروپا بەتەنیا گفتوگۆی بەشە وردەکانیمان نەکرد.. بەڵکو ئەو (چەمك)انەمان گفتوگۆ کردن کە حوکمی ئەو بەشانە دەکەن و، لق و پۆپیان لێ دەبێتەوە و، ئەمەش واقیعە لە هەمو (سیستەم) و هەمو بیرۆکەیەکدا: کە بریتیە لە تێڕوانینێکی دیاریکراو بۆ تێکڕای شتەکان، پاشان وردەکاری و لقەکانی لەسەر بنیات دەنێین.

ئیسلامیش بە سیفەتێکی تایبەتی دەبێ بەهەمانشێوە وەرگیرێ.

چونکە هەر چەند بیرەکە گەورەتر و گشتگیرتر بێ پتر پێویست دەکا پەی بەوێنە هەموەکیەکەی ببردرێ پێش توێژینەوەی وردەکاریەکان. ئیسلامیش مەزنترین بیرە بەدرێژایی مێژو لەسەر زەویدا ناسرابێ و، گەورەترین چەمکە هەمو ژیان بگرێتەوە.

بۆیە پێش ئەوەی پرسیار بکەین کە کۆمەڵگەی موسڵمان و، ئافرەتی موسڵمان و، پیاوی موسڵمان چۆن دەبن. دەبێ ئەو وێنەیە بناسین کە (مرۆڤ) لە چەمکی ئیسلامدا وەریدەگرێ.

❊ ❊ ❊

ئەوەی کە بڕیاری پایەی مرۆڤ دەدا لە چەمکی ئیسلام.. بریتیە لە خودا.. ئەو خودایەی کە وەدیهێناوە و، بە وەدیهێنراوانی خۆی لە هەموان شارەزا ترە.

خوداش دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وحَمَلْنَاهُمْ فِـي الْـبَرِّ وَالْبَحْـرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَات وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً: ئێمە ڕێزمان لە تۆرەمەی ئادەم گرت و لـە وشـكانی و لـە زەریـادا هـەڵمانگرتن، ڕۆزی پاكژمـان پێداون، لەچاو زۆر لە كردەی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتون.﴾الاسراء/٧٠.

كەواتە مرۆڤ -هەر لەسەرەتاوە- ڕیزی لێگیراوە و بەچاتر دانراوە و پایە بەرزە.

هەروەها خودا دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِـينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: كاتێ كە پەروەردگاری تـۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند: وا خەریكم مرۆڤێك لە قوڕ دروستكەم، هـەركاتێك لەشـیم تەواو كرد و لەگیانی خۆم فوم پێداكرد، هەموتان سوژدەی بۆ بەرن.﴾ص/٧١-٧٢.

بڕیاری ئەوە دەدا كە مرۆڤ چەنگە قوڕێكی زەویە كـە فویـەك لـەروحی خـودا سەروەری وڕێزی بەسەر وەدیهێنراوەكانی دیكـەدا پـێ بەخشـیوە. كەواتـە مـرۆڤ دورەگەزە تێكەڵبوە نەك یەك ڕەگەز. بۆیە -لە هەمو شـتێكدا- دو سروشـت و دو ئاراستەی هەیە: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَـحَ مَـنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا: بـەگیانی مـرۆڤ سـوێندبێ و بـەوەش كـە ڕێكـی خستوە، ئەوسا هەمو تاوانباری و پارێزگاری دەویژدانیدا گەیاندوە، دیـارە هـەركێ گیـانی خـاوێن ڕاگرتـوە ڕزگـار بـوە، هەركەسـێكیش دە گوناهیـــەوە پێچـاوە، دۆڕاندویە.﴾الشمس/٧-١٠

﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ، وَلِسَانًا وَشَفَتَيْنِ، وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْـنِ: ئـەدی ئێمـە دو چاومان پێنەداوە، زمانێكیش و جوتێ لێو؟ ڕێگـەی هـات و نەهاتیشـمان نیشـان نەدا؟﴾البلد ٧-١٠

﴿إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا: خۆمان ڕێگەمان پیێنیشـــاندا، جـا یان شوکرانەبژێرە یان پیێنەزان. ﴾الانسان/٣.

مرۆڤ بەهەمو قەوارەکەیەوە ڕێزدار و باشترە.. چونکە مشـــتە قوڕەکـە لەگـەڵ فوە ڕۆحەکە تێکەڵ بوە و لە زەوی بۆتەوە و، لە قوڕی دیکە تاك و جودا بۆتـەوە و. -بەم قەوارە تێکەڵبوەی- لەلای خودا بەڕێز و هێژایە. هیچ پیســی و بێزەوەریـەکی تێدا نیە، مادام لەگەڵ فریشکی[1] خۆی دەڕوا و لەگەڵ قەوارە ڕەسەنەکەیدا کـۆك و گونجاوە. ئارەزوەکانی لە قوڕی زەوی و کیمیای زەوی هەڵقوڵاوە.. ئارەزوی خـۆراك و سێکس و پێداویستیەکانی دیکەی جەستە کە ئـەمڕۆ زانسـت دەڵـێ بریتـین لـە کۆمەڵە کارلێکێکی کیمیایی.. ئەم ئارەزوانە لە مرۆڤدا پایە و نرخی دانابـەزێنن، ئەمەش بە مەرجێك.. کە لەسەر شێوەی ڕەسەنی خۆی لە فریشکی مرۆڤـدا بمێنـێ تێکەڵ بە فوی ڕۆحی خودا، نەلێی جودابێ و نە بەزەویەوە نوسابێ: ﴿قُلْ مَنْ حَـرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَـاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ: بڵێ: کێیە، جلکی جوان و خشڵ و بژێـوی پـاکژی- کـە خوا بە عەبدەکانی خۆی رادیوە- لای وایە کە ناڕەوایە؟ بڵێ: ئەمانە شـایانی ئـەو کەسانەن کە لە ژیانی دنیادا بڕوایان بەخوا هێناوە و ڕۆژی دواییش هـەر تایبـەتی بەخۆیانە. ﴾الاعراف/٣٢.

﴿زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ: ئارەزوی ژنان کـردن و کـوڕی زۆر پەیداکردن بۆ مەردم رازاوەتەوە. ﴾ال عمران/١٤ پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((فِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ: ئەندامی هەریەکەتان پاداشتی پێوەیە)). گوتیان: ئـەی پێغەمبەری خوا چۆن یەکێکمان ئارەزوی خۆی تێرکا و پاشانیش پاداشـتی لـەباتی

[1] فریشك: فطرة .

وەردەگرێ؟ فەرموی: ((أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ: ئـەدی ئەگـەر لە حەرام بەکاری هێنا، ئایا گوناهبار دەبێ؟)) گوتیان: بەڵێ. فەرموی: ((فَـــإِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ عَلَيها أَجْرًا: جـا ئەگـەر لـە حـەلال بەکاریـهێنا ئـەوا پاداشتی لەباتی وەردەگرێ)).رواه مسلم.

مرۆڤیش لەدیدی ئیسلام (مرۆڤ)ە.. مرۆڤایەتیەکەی لەوەتەی هەیە چەسپیوە، باڵایە، بەرزە، بەهۆی فوی خودا بۆوی لە رۆحی خـۆی. ئـەو فـوە خوداییـەش لـە مرۆڤدا هەردەم بەرەو سەرچاوەکەی رێنوێن دەبێ. هـــەر بـە فریشـك بـەرەو خـودا رێنوێن دەبێ ئەگـەر فریشـکەکەی سـاغ بـێ و، مرۆڤیـش بـەخۆی ئـەو فریشـکە پەردەپۆش دەکا و لێڵایی دەخاتە سەر و دایدەپۆشێ بۆیە رێچکەکەی بەدی ناکا و، لەو کاتەدا لارێ دەبێ و، گومڕا دەبێ و، هەمو جۆرە ستەمێکی لـێ دەکەوێتـەوە: ستەم لـە خـۆی و لـە خـەڵك و، هـەمو جـۆرە کـارێکی خـراپ و هـەمو جـۆرە سنوربەزاندنێك.

پاشان مرۆڤ وای لێداواکراوە خۆی پـاك بکاتـەوە و پیسـی نـەکا. خـۆی پـاك بکاتەوە و فریشکەکەی بدرەوشێنیتەوە، جا بەرەو خودای وەدیهێنەری رێنوێن دەبێ و، ئاراستەکردنی لێوەردەگرێ. بۆیە کاتێ ئەوە رودەدا ئەم گەردیلـــە لاوازە وێـڵ و فانیە.. دەبێتە بەهێزترین رەگەز و گەورەترین وزەی سەر زەوی و.. بەڕاستی مرۆڤ دەبێتە جێنشینی خودا لەسەر زەوی: بنیاتدەنێ و ئاوا دەکاتەوە و، دادەمەزرێنێ و دروست دەکـا و، دادەهێنـێ و رێکدەخـا، لـەروحی خـوا و لـە ئاریکـاری خـواوە هەڵدەهێنجێ، و بەرەو راستە شەقام رێنوێن دەبێ.

بەهەمانشێوە ئیسلام سیستەمێکی هاوسەنگە..

هەروەك لە نێوان چنگە قوڕێك و فوەڕوحێك هاوسەنگی سازداوە و، لەیەك شت تێکەڵی کردون، بەهەمانشێوە هاوسەنگی لــە نێــوان هــێزە جیاجیاکــان و وزەکــان لەناخی مرۆڤ و لە واقیعی ژیانیشدا سازدەدا.

لەنێو دەروندا هاوسەنگی لەنێوان واقیعی ماددی و واقیعی رۆحــی دەســازێنێ، لەنێوان هاندەری ئارەزو و رەهابونی رۆح، لە نێوان واقیعــی بەرهەســت و واقیعــی ئەودیوی هەست، لەنێوان هەســتی شــاردراوەی نێــو ویــژدان و رەفتــاری روکەشــی بەرچاوان. لەنێوان فشاری زەرورەت و ئازادی ئاراستە و هەڵبژاردن.

هەروەها هاوســەنگی لــە واقیعــی ژیــاندا لــەنێوان هــێزە مــاددی و ئــابوری و سیاسیەکان دەهێنێتە ئارا، لەگەڵ هــێزە رەوشــتی و مەعنــەوی و رۆحیــەکان، لــە نێوان تاك و کۆمەڵگە و، لەنێوان بەرژەوەندی نەوەیەك و بەرژەوەندی نەوەکان.

هەروەك بەردەوام دین و دنیا تێکەڵ دەکاو.. دنیا و قیامەت لە سیســتەمێکدا دەکاتە یەك.

هەروەها ئیسلام سیستەمێکی کردەکیە[1]

تەنیا بە وەعز و ئیرشاد و (پاککردنەوەی رۆح) وازناهێنێ.

ئیسلام چاك دەزانێ رۆح بە وەعز و ئیرشــاد پــاك نابێتــە وە ئەگــەر کۆمەڵگــە گەندەڵ بو و سیستەم لە گرێژنە چوبو و ئابوری ستەمکار بو و سیاسەت پاك نــەبو. جیاوازی لەنێوان رۆح و جەستە و لەنێوان واقیع و میسالدا دروست ناکا. دەزانێ بۆ ئەوەی بگاتە ئامانجی پاککردنــەوەی رۆح دەبــێ سیســتەمێکی ئــابوری دادگــەر و سیستەمێکی کۆمەڵایەتی هاوسەنگ و، سیستمێکی سیاسی پێگەیشتوی تونــد و تۆڵ و پتەو دامەزرێنێ.

---

[1] کردەکی: عملي

جا لەبەر ئەوەیە کە مەبدەئەکانی لە چوارچێوەی جوانی نمونە بەرزەکان دادانێ و، لە بەرزیەکەوە هەڵیانواسێ. چونکە بۆ ئەوە هەوڵدەدا کە بیرەکە لە جیهانی واقیعدا وەدیبێنێ، لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵگە بە تەواوی.. بەهەمو لایەنێکیەوە.. لەسەر بنچینەی ئیسلام.

پاشان -بۆ ئەوەی کۆمەڵگە بەڕاستی موسڵمان بێ- دەبێ حکومەتی موسڵمان و، قوتابخانەی موسڵمان و، خێزانی موسڵمان و، تاکی موسڵمان و، رادیۆی موسڵمان و، رۆژنامەی موسڵمان و کتێبی موسڵمان و، سینەمای موسڵمان و، ریکلامی موسڵمان و، بێژەری موسڵمان و، هونەری موسڵمان و، ئابوری موسڵمان و، هزری موسڵمان و بگرێتەوە و، هەمو شتێك دەبێ لە ئیسلامەوە هەڵقوڵێ و ملکەچی بەرنامەی ئیسلام بێ.

مەبەستمان لە رادیۆ و رۆژنامە و کتێب و سینەما و هونەر و... تاد. ی موسڵمان ئەو وێنە ساکارە نیە کە لەناوی (ئاین) دەفامرێتەوە: کە هەموی ببێتە وتاری سەر مینبەر و وەعزی ئاینی.[1]

نەخێر. ئیسلام پێویستی بەمە نیە و، فراوانتر و گشتگیرتر و بەرکراوە ترە لەوەی ببێتە وتارگەلێکی هەراسان و قسە و باسی دوبارە.

ئیسلام بریتیە لەهەمو ژیان لە وێنەیەکی خاوێندا.. ئەو وێنەیەی لەگەڵ سەرجەم فریشکی ژیان تێکدەکاتەوە.. ئەو فریشکەی تەنیا بە بەجێگەیاندنی زەرورەت وازناهێنێ بەڵکو چاککاریش دەکاتە ئامانج.

جا هەر شتێك ئەمەی لەسەر پیادە بکرێ ئەوە ئیسلامە.

---

١ هەروەك بەداخەوە لە کوردستاندا رویدا و ئێستاش لە هەندێ کەناڵدا بەردەوامە. -وەرگێڕ-

ئەو شیعر و هەڵبەستەی کە لە بارەی جوانی بێپایانی سروشت دەدوێ و، ئەوەی کە باسی هێز دەکا و، ئەوەی باسی رەهابونی وزەی مرۆڤ بۆ کار و بەرهەمــهێنان دەکا. ئەوەی دەربارەی هەست و ســۆزە پاکــەکانی مــرۆڤ دەدوێ، ئــەوەی مــرۆڤ بەرەو پێش هاندەدا و دەیبزوێنێ، ئەوەی دەرگای هیوا بۆ مرۆڤایەتی ئاوەڵا دەکــا، ئەوەی وا لە خەڵك دەکات هەست بە جوانی ژیان بکەن کە شایستەیە مرۆڤ تیایدا بژی، ئەوەی لە بارەی ئازار و ژانــەکانی مــرۆڤ دەدوێ، ئــەوەی داوای نەهێشــتنی زوڵم و ستەم و، چاکسازی گەندەڵی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی دەکا و ئــەوەی ژیان پێویستە چۆن بێ ئاوای وەسف دەکا.. ئەوە هەموی شیعری ئیسلامیە چونکە دەربڕینێکە لە فریشکی پاك، ئەگەر چی تەنیا جارێکیش ناوی ئاینی تێدا نەهاتبێ و، راستەوخۆ چەمکەکانی ئاینی تێدا نەخرابێتە ڕو.

بەڵام ئەو شیعرەی تایبەتە بە وەسفی هاندەری پڕ خلتە و خاری جەستە. ئــەوەی هەموی لە دەوری خەونی سێکسی روداو یا هی خەیاڵی تامــەزرۆ خــول دەخــوات، ئەوەی وەسفی جەستەی ژنێکی روت یا حەزبرسی دەکــات. ئــەوەی وەســفی ســاتی ملکەچبون بۆ زەرورەت دەکا نەك بەرزبونەوە لە زەرورەت و، ئەو شیعرەی کە رق و کینە دەوروژێنێ و.. ئەو شیعرەی وەسفی ساتە لاوازەکانی مــرۆڤ دەکــا بەهــەمو جۆرەکانیەوە. ئەو شیعرەی گوزارە لــە گومڕایــی مــرۆڤ و بودەڵــەیی و تاریکــایی دەکا..

ئەمە هەموی شیعری ئیسلامی نیە.. هەر چەند بەتەنیا وشەیەکیش بەگژ ئــاین و بیروباوەڕ و چەمکی (رەسمی) رەوشتدا نەچوبێ، چونکە نوێنەرایەتی فریشــکێکی لاڕێ، یــا فریشــکێکی لاواز دەکــا ئــەوجا لەگــەڵ ئامــانجی رەســەنی ئیســلامیدا ناکەوێتەڕێ.

خەڵکە واقیعی و سروشتی و هاوشێوەکانیان رەنگە بپرسن: بۆ ئایا ساتی لاوازی حەقیقەتێکی مرۆڤانە نیە؟ ئەدی چۆن هونەر دەرینەبڕێ؟ وەڵامیش ئەوەیە کە یەکەم، هونەر رێکۆردەرێك نیە هەمو شتێك وەکو خۆی تۆمار بکا، بەڵکو بەخۆی دەبێ ئەو (گرتە)[1]یە هەڵبژێرێ کە تۆماری دەکا. دوەمیش ئەوەیە کە ساتی دابەزین جوانترین شت نیە لە مرۆڤ و لە هەمو شتێك شایستە تر نیە بۆ تۆمارکردن. بەڵکو ئەوەی شایستەی تۆمارکردنە بریتیە لەو ساتەی مرۆڤ خودی خۆی تێدا وەدیدێنێ. ساتی تێکەڵ بونی قوڕ لەگەڵ فوی رۆحەکە، نەك ساتی جودابونەوەی قوڕ و بەزەویەوە نوسانی، وەڵامی سێیەمیش ئەوەیە کە دەکرێ ساتی دابەزین بەشێوەیکی هونەری بەتەواوی تۆمار بکرێ، بەمەرجێك نەبێتە تەوەری چێژ بەخشین و وروژاندنی سەرسامی. واتە دابەزین نەبێتە ئەو پاڵەوانێتیەی گورزە تیشکی دەخرێتە سەر! بەڵکو تیشك دەخرێتە سەر ساتی وەئاگاهاتنەوە، ئەو ساتەی مرۆڤ تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ رەسەنایەتیفریشك، ئەو ساتەی چەنگە قوڕەکەی تێدا دەگەڕێتەوە هەتا لەگەڵ فوە رۆحەکە تێکەڵ دەبێ و، نمونەی ئەمەش چیرۆکی یوسف (عليه السلام)ە لە قورئانی پیرۆزدا. سەربردەیەکە وەسفێکی ورد و وێناکردنێکی بەرزی تێدایە و هیچی لە جوانی هونەر کەم نیە و. ساتێکیش لەساتە ئەستورەکانی ژیانی (واقیعی) دەرونی مرۆڤ دەخاتە رو! ساتی وروژاندنی ئارەزو و زاڵبونی بەسەر هەمو دەنگ و هەمو بانگەوازێکدا. لەگەڵ ئەوەشدا وەسفێکە ئارەزوان نابزوێنێ و نابێتە مایەی چێژوەرگرتن لە دیمەنی سێکس. ئەگەر نەڵێین بەپێچەوانەوە بەرز و باڵا بون لەوساتە دابەزیوە دەوروژێنێ و بانگەواز بۆ ئاگا لەخۆبون دەکا.

---

[1] گرتە: لقطة

ئەوەی بەسەر هونەردا پیادە دەبێ بە شیعر و پەخشان و کەڤاڵەکانیەوە[1] بەسەر سینەما و شانۆ و رادیۆ و مۆسیقا و گۆرانیشدا پیادە دەبێ. بەمجۆرە ورووژێنەرە شێتانەکان نامێنن کە لاوان هار و هاج دەکەن و برسیەتیەکی هارانە دەخاتە نێو خوێنیانەوە. لەهەمانکاتیشدا کۆمەڵگە رەگەزی چێژ وەرگرتن و رەگەزی جوانی لەدەست ناچێ.. چونکە هەمو خۆشیەك پیسی و قرێژ نیە.

جا ئەوکاتە لەلای گەنج و لاوان زەحمەت نابێ کە هەوڵی رەوشتبەرزی بدەن و تواناشیان پێیدا بشکێ. بەڵکو هەر ئێستا لەبەریان گرانە و، مەحاڵە، چونکە ئەوان کە هەر گۆشت و خوێن و حەز و ئارەزون، شەو و رۆژ لەناوەندی ورووژێنەری شێتانەدا دەژین، کە بەردەوام فو لە دەماری گڕگرتویان دەکا و، خراپەکاریان لەبەر چاوان جوان دەکا و، کچ و کوڕانی دودڵ هاندەدا و، لە هەمانکاتیشدا -بە ئامرازە جیاجیاکانی- رێی هەمو دەنگێکی رەوشتبەرزانە و هەمو ئاراستەکردنێکی دروستیان لێدەگرێ.

جا ئەو کاتە کچ بچێتە دەرێ یان نا، ئیش بکا یا ئیش نەکا.. چاوی بەپیاوان بکەوێ یان نا.. ئەوا عیبرەت بەڕوکەشی کارەکە نیە بەڵکو عیبرەت بە ئامانج و چۆنیەتی جێبەجێکردنیەتی.

کاتێك کۆمەڵگەی موسڵمان کە لەسەر رەوشتەکانی ئیسلام و سیستەمی ئیسلام دامەزراوە، دێتە ئارا، ئەو کاتە دەکرێ بەدوای وردەکاری و لکەکاندا بگەڕێین وە لە رەوشی ئافرەت و رەوشی پیاو و هەمو شتێکی نێوانیان بپێچینەوە.

بەڵام لە سەرەتادا دەبێ لە ئاست دامەزراندنی کۆمەڵگەی موسڵمان ئارخەیان بین.

---

[1] کەڤاڵ: تابلۆ، لوحە.

کۆمەڵگەیەك روی لە خوا بێ و، بەرنامەی ژیانی خۆی لێ وەرگرێ و، لەسەر ئەو رێنوێنیە بڕوا کە بۆی هەڵبژاردوە.

کۆمەڵگەیەك خوا بپەرستێ. بەکردەوە بیپەرستێ نەك بە قسە. پەرستن و فەرزەکانی بەباوەڕ و جێبەجێکردنەوە ئەنجام بدا: ((**ليس الإيمان بالتمني، ولكن ما وقر في القلب و صدقه العمل**: بڕواهێنان بەخۆزگە نیە. بەڵکو ئەوەیە کە لەدڵدا ئۆقرە بگرێ و لەکردەوەش رەنگبداتەوە)).

کۆمەڵگەیەك تەنیا بەوەندە وازنەهێنێ کە نوێژ بکا و رۆژو بگرێ و زەکات بدا.

کۆمەڵگەیەك کە فاحیشە ئەنجام نەدا و رێگە نەدا ئەنجام بدرێ و بانگەوازی لەبۆ ناکا و بەچاك و بە شیرینی دانانێ.

کۆمەڵگەیەك لەسەر خۆشەویستی و ئامۆژگاری و فەرمان بە چاکە و بەرهەڵسی لە خراپە دامەزرابێ.

کۆمەڵگەیەك دزی نەکا و درۆ نەکا و فێڵ نەکا و هەڵنەخەڵەتێنێ.

کۆمەڵگەیەك غەیبەت نەکا و جاسوسی نەکا و تانە و تەشەری نەبێ.

کۆمەڵگەیەك تیایدا دڵنیابی لەو کرێکارەی کارت بۆ دەکا کە فێڵت لێناکا و ماڵت نادزێ و، لە فەرمانبەر کە یاری بە بەرژەوەندیت ناکا و، لە بازرگان کە لە نرخ و جۆری کالاّ فێڵت لێناکا و، لە مامۆستا کە خانەی وانەکانی پڕناکاتەوە و واز لە قوتابیان دێنێ بکەون هەتا وانەی تایبەتی وەرگرن و، لە قوتابی کە لە تاقیکردنەوە قۆپیە ناکا و زانستەکەی وەك ئامرازێکی خراپەکاری وەرناگرێ و، لە مێرد کە زوڵم لە ژنەکەی ناکا و قەوارەکەی بەفیڕۆ نادا و، لە ژن کە لە ماڵ و ناموس خیانەت لە مێردەکەی ناکا و، لە باوك کە درۆ لەگەڵ منداڵەکانی ناکا تا فێرە درۆیان بکا و، خۆی بۆیان ناکاتە پێشەنگ و نمونەیەکی خراپ و، بە ترسنۆکی

و زەلیلی و لێکداپچڕاوی و سلبیەت پەروەردەیان ناکا و، لەگەڵ کوڕێك کە فێڵ لە باوکی ناکا و دایکی ناخەڵەتێنێ و شەڕەنگێزانە ڕەفتاریان لەگەڵ ناکا.. لەگەڵ حوکمڕان و حوکمکراو و گچکە و گەورەش بەهەمان شێوە و وەکو یەك.

کۆمەڵگەیەك کە بوارە ئابوریەکانی هاوسەنگن.. نە هەژار لەبرسان دەمرێ و نە دەوڵەمەند بە سامان دڵی گەند دەبێ.

کۆمەڵگەیەك کەسی بێکاری تێدا نیە، چونکە بێکاری لە سەرچاوەکانی خراپەیە، کەس بێکار نیە کە کاری دەست نەکەوێ و، کەسیش بێکار نیە لەبەر ئەوەی بۆ خۆی پوچە و ناو دڵی بەتاڵە..

کۆمەڵگەیەك لە ئاست تاکدا لە سنور دەرنەچێ و بواری تاکیش نەدا سنور ببەزێنێ.

کۆمەڵگەیەك ئاشتی خۆشبوێ و بۆ ئاشتی کاربکا، ئاشتی لە ماڵ و لە شەقام. لە تاك و، لە هەموان.

کۆمەڵگەیەکی چالاکی کارگەری بەرهەمهێنی هزرمەند کە بەردەوام بەرەو بەرزی بچێ.

* * *

ئەوە بریتیە لە کۆمەڵگەی موسڵمان..

کێ جورئەت دەکا رقی لەم وێنە جوانە بێ یا لێی دورکەوێتەوە؟

کێ مەگەر رموزنێکی تێکشێواوی فریشك خوار و خێچ کە هەر بیەوێ وەکو ئاژەڵ رابوێرێ یا هەر لە کۆمەڵگە وەرگرێ هیچ نەبەخشێ؟

ئاساییە ئەگەر ئەمەش وەك وێنەیەکی تێکڕای لە قالب داڕێژراو وادەرکەوێ کە هەندێك نمونەی خەیاڵین یا خۆزگە و خەونن.

بـەلاّم ئـەوە واقیعێکـە زەمـین جـارێك بەهـەمو حەقیقـەت و هـەمو واقیعیەتیەکەیـەوە بینـی، لـە یـەکێك لـەماوە هـەرە بالاّکـانی مێـژو. رەنگـە بشگەڕێتەوە.

دەشگەڕێتەوە.. ان شاء اللّٰه.

لەو کۆمەڵگەیەدا مرۆڤ نابنە فریشتەی پاك و بێگوناح، بەڵکو ئەوان مرۆڤن و فریشکی راستەقینەی خۆیان وەدیدێنن، چنگە قورێك تێکەڵ بـەفوی رۆح. خـۆ لـە فاحیشە بەرز دەگرن، چونکە پێویستیان بە فاحیشە نیە.

هەر بە سروشت هەموشیان هەروا نابن.

لەو کۆمەڵگە رەببانیەشدا کە محمدی کـوڕی عـەبدوڵلاّ ﷺ بەکەسـێتی بـەرز و رێزدار و رۆحی پاك و بالاّی خۆی دایمەزراند، هی وا هەبو تانە و تەشەر لە ناموسی خودی پێغەمبەر بدا وەك لەسەربردەی بەناوبانگی ئیفك دا هاتوە.

نەخێر! هەرگیز لە هیچ شوێنێکی سـەر زەوی و لـە هیـچ ماوەیـەکی مێـژو وا رونادا کە خەڵك هەمویان چاك بن.

لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیەکی گردەبڕ و ئاشکرا لە نێوان کۆمەڵگەیەك هەیـە کـە تاوان تیایدا تاکتاکەی ریزپەڕبێ و بەرهەڵستی بکرێ، لەگەڵ کۆمەڵگەیەکی وا کـە رقی لە رەوشتبەرزی بێ و بە ریزپەڕی تێبگا، هەروەك ئەو کۆمەڵگەیـەی قورئـانی پیرۆز باسوخواسیان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِنْ قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ: خێزانی لوط لە شاری خۆتان دەربکەن، چونکە ئـەوان چاویـان لـە داوێن پاکییە.﴾النمل/٥٦. و هەروەك ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئێمەی تێـدا دەژیـن و هێندەی نەماوە وای لێبێ.

* * *

لەم کۆمەڵگەیەدا[1] ڕەوشی ژن و ڕەوشی پیاو وەکو یەك دەخەینەڕو.

کۆمەڵگەی ئازادان.. پیاوی ئازاد و ژنی ئازاد.

واتای ئازادیش لە ئیسلامدا زۆر فراوان و سەرتاپاگیرە.. هیچ مەدلولێکی دیکە لەو مەدلولانەی تاکو ئەمڕۆ لە ڕۆژهەڵات یا ڕۆژئاوا بۆ ئازادی لە ئارادان بۆ ئاستی ئەو بەرز نابنەوە.

ئازادی لە ئاست هەمو بەهاکان و هەمو هێزەکان و هەمو بایەخەکان و..

یەك بەندایەتی بۆ: خوا.

خودا تاکە پەرستراوە لەکۆمەڵگەی موسڵماندا. نە ماڵ و نە سامان و نەپلە و پایە و نە ئارەزو و نە هەوەس و نە مرۆڤ هیچیان پەرستراو نین.

خودا تاکە پەرستراوە.. هەمو شتێکی دیکەش بابردەڵەن.

ژن و پیاویش هەردوکیان بەندەی خودان. لەمە بترازێ ئازادن و ئازادی خۆیان لە خودی ئەو بەندایەتیەیان بۆ خودا هەڵدە هێنجن.

کاتێك مرۆڤ بەڕاستی خوا دەپەرستێ و، بەڕاستی پەیوەندی پێوە دەکا و، بەڕاستی هانا و کۆمەکی لێ دەخوازێ، لەو ساتەدا هەست بە گرنگی و بودەڵەیی هەمو هێزێکی دیکەی سەر زەوی و، هەمو بەها و هەمو شکۆ و هەمو دەسەڵاتێك دەکا.

جا ئەو کاتە ئازاد دەبێ.

لەو فشارە ئازاد دەبێ کە چ لە ناخی دەرونی خۆی و چ لە دەرەوە کەوتۆتە سەری. فشاری ئارەزوەکان و زەرورەت لە لایەك و، فشاری کۆمەڵگە و هێزە

---

[1] مەبەست لە کۆمەڵگەی موسڵمانە. –وەرگێڕ–

ئابوری و کۆمەڵایەتیەکانی لە لایەکی دیکە.

ئازاد دەبێ.. چونکە بەخواوە بەهێزە، بە خواوە دەوڵەمەندە، لە خودا دەخوازێ و گەیشتۆتە پارێزی خودا.

لە مردن ناترسێ و، لە هەژاری ناترسێ و، لە زوڵم ناترسێ و، لە خەم ناترسی و، لە ئێستا ناترسێ و لە سبەی ناترسێ.

ناترسێ.. نەك لەبەر ئەوەی گوێ ناداتێ.. بەڵکو لەبەر ئەوەی بەو هێزە راستەقینەیە پەیوەستە کە خاوەنی هەمو شتێکە لەژیاندا و، لەبەر ئەوەی ئامادەیە بەرامبەر هەمو ئەو زوڵم و ستەمەی لێی دەکرێ تێبکۆشێ و، یارمەتی لە خودا بخوازێ و، دڵنیابێ لەوەی کە خوداش یارمەتی دەدا.

ئازادبونەکەشی واتای ئەوەی نیە کە بۆ هیچ سیستەمێك ملکەچ نابێ.

نەخێر! چونکە ژیان بەمشێوەیە بەرێوەناچێ و، هەرگیز ئەوەش رونادا مەگەر کاتێك کە شوێن حەز و ئارەزوەکان بکەوێ. ئەمەش ئازادبون نیە.. چونکە ئازادبون مانای ئازادبونە لە حەز و ئارەزوەکانیش.

بەڵکو ئازادبون ئەوەیە کاتێك بۆ ئەو سیستەمە ملکەچ دەبێ کە خودا هەڵیبژاردوە، لە راستیدا بۆ خودا ملکەچ دەبێ و، راستەوخۆ لەگەڵ خودا مامەڵە دەکات.

پاشان گوێڕایەڵی کاربەدەست و گوێڕایەڵی سیستەمەکەی دەبێ کە لە شەریعەتی خواوە وەرگیراوە و، ئامۆژگاری و ئاراستەکردنی بۆ دەخاتە رو کە لەگەڵ چاکە و خێری گشتیدا دەگونجێ.

بەمجۆرە گوێڕایەڵی و ئازادی لەم وێنە ناوازەیەدا تێکەڵ دەبن کە لە سیستەمی خودا بترازێ لە چیدیکەدا نیە.

بەهەمانشێوە ژن نابێتە بەندەی پیاو کاتێك گوێڕایەڵی دەکا -لەو سنورەی لە شەریعەتی خوا بۆی دیاریکراوە- چونکە مافی ئەوەی هەیە -بەڵکو ئەرکی خۆیەتی- کە مێردەکەی ناڕاستە بکا ئەگەر دیتی لەڕێگەی خودا لایداوە.

* * *

ژن نابێتە بەندەی پیاو.. چونکە هەرگیز کەس نابێتە بەندەی یەکێك جگە لە خوا.

ناشبێتە بەندەی کۆمەڵگە و نابێتە بەندەی هیچ هێزێك لە هێزەکانی سەر زەوی.

بەڵکو ژن -وەکو پیاو- بەندە و گوێڕایەڵی خوایە و، راستەوخۆ مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و، هەستدەکا شوێنکەوتەی دڵراستانەی فەرمانەکانی خودایە و بەتەنیا و، لەڕێگای خوداوە هێزێکی تەواوە: ﴿رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ، رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ: پەروەردگارمان؛ هەرکەس تۆ بیخەیتە ئاگر، توشی شورەییت کردوە. ئەوانەی ناهەقیکارن هیچ کەس دەهانایان نایە. پەروەردگارمان؛ ئێمە بیستمان بانگ ڕایەڵێك گازی دەکرد کە باوەڕی بە پەروەردگارتان بێنن، ئێمەش باوەڕمان هێنا، سا بۆ خۆت ئەی پەروەردگارمان! لە گوناهانمان خۆش ببە و هەر خراپەی کردومانە وەیکوژێنەوە و دەگەڵ ئەوانەی پیاوچاکن بمان مرێنە. پەرورێنمان ئەو شتانەش بە ئێمە ڕەوا ببینە کە لە زوان پێغەمبەرانتەوە بەڵێنت پێمان داوە، شەرمەزاری رۆژی قیامەتمان مەکە. تۆ لە هەر پەیمانێ بیدەی لاریت نیە. پەروەرگاریان ئاوا بە

دەنگیانەوە هات، کە: من کردەی هیــچ مرۆڤێـك -لـەنێر و مــێ- بـەبێ پـاداش ناهێڵمەوە؛ هەمووتان لەلای من چون یەکن. ﴾ال عمران/١٩٢-١٩٥

ئەم پەیوەندیە بەخودا ڕێزی مرۆڤانە و سەربەخۆیی راستەقینە بە ژن دەبەخشێ. ژن لە لای خۆی و -لە لای خــوداش- وەدیـهێنراوێکی مرۆڤانـەی خـاوەن ڕێـزە و بەخوداوە پەیوەستە و، هەمو ژیان و هەمو قەوارە و هەمو هێزەکـانی لـە خـوداوە دەخوازێ.

ئەم پەیوەندیەش کەسایەتی پــێ دەبەخشــێ -بەهـەمان شـێوەی کـە کەسـێتی بەپیاو دەبەخشێ.

ژن بەشێك نیە لــە کـەس. قەوارەیـەکی نەقوسـتان نیـە کـە لـە قەوارەیـەکی مرۆڤانەی دیکەوە خۆی تەواو بکا (تەنیا مەگەر بەو هێنـدەی کـە پیـاو قـەوارەی خۆی لە پەیوەندی هاوسەرێتیدا تەواو دەکا.. کە ئەمەش مەسەلەیەکی دیکەیە..)

کاتێکیش گوێڕایەڵی پیاو دەکا لەو شتانەی خوا بەسەریدا فەرزی کـردوە، ئـەوا قەوارە و سەربەخۆیی و کەسێتی خۆی بزر ناکا. بەڵکو سەنگی مەحەکی کەسـێتی و سەربەخۆیی بەردەوام ئەوەیە کە مافی ئەوەی هەیە -بەڵکو لە ئەرکی خۆیــەتی- پیاو بۆ ڕاستەڕێ بگێڕێتەوە کە دەبینێ لەراستە شەقامی خودا لایداوە.

هیچ شتێك هەستی هەبونی کەسێتی بەمرۆڤ نابەخشێ هێنـدەی ئـەو مافـە.. مافی ئاراستەکردن.

تێکڕای تێکۆشانی گەلان لەپێناو هەستکردن بە خــودی خۆیـان و وەدیـهێنانی قەوارەیان ئەوە بوە کە بەو مافە بگەن..

مافی ئاراستەکردنی فەرمانڕەوا کاتێك لەو بنەما گێژاوانە دەردەچــێ کەهـەمو کەسێك لە فەرمانڕەوا و بەرفەرمانان بۆی ملکەچ دەبن.

ئەو مافەش مافی هەمو تاکێکە لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا، وەکو یەك مافی ژن و مافی پیاوە.

کاتێك ژنیش هەست بەو هێزە دەکات لە خۆیدا کە لە پەیوەندی بەخوداوە دەیخوازێ. ئەوا لەناخی قەوارەیدا کەسێتیەکی سەربەخۆ و خودی وەدیهاتوی خۆی لە واقیعی ژیاندا دەبێ.

سەربەخۆییش ئەوە نیە کە ڕکە لەگەڵ مێردەکەی بکا و هەڵوێستی وابێ کە بۆ هێرشکردن ئامادەبێ.

ژیان شەڕ نیە لەناو ماڵێدا، بەسە کە جەنگێك بێ دژی هێزەکانی خراپەکاری کە لە هەمو شوێنێکدا ئامادەن.

ژیان لە ماڵێدا خۆشەویستی و ئۆقرە و ئارامە: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً: هەر لە نیشانانی خودایە کە لە خۆتان، ئاوجوتی بۆ بەرهەم هێنان؛ کە پێیان بحەسێنەوە و خۆشەویستی و ئەوینی خستۆتە ناوتان.﴾الروم/٢١.

کاتێك خۆشەویستیش هەبێ تێکەڵبونی تەواو دەبێ کە هیچ یەکێك لە هاوسەران هەست ناکا کە لەکوێ کۆتایی دێ و ئەوی دیکە لەکوێ دەست پێدەکا..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ساتانێك هەن هەریەکەیان حەز دەکات هەست بە خودی خۆی بکات و سنوری قەوارەی خۆی بزانێ..

ئەوانەش سنورەکانن..

هەردوکیان بەندەی خودا، هەریەکەشیان مافی ئەوەیان هەیە -بەڵکو ئەرکی خۆیانە- کە ئەوی دیکە بۆ تاعەتی خوا ئاراستە بکا.

بەڵکو ژن دەتوانێ -بەتوندی- ناڕەزایی لەپیاو دەربڕێ ئەگەر سەرپێچی کرد.

تەنانەت دەتوانێ پێی بڵێ: لە ئەمڕۆوە من ژنی تۆ نیم، مادام لە تاعەتی خودا دەرچوی.[1]

بەمشێوەیە لەرێگەی پەیوەست بونەوە بە خودا هەست بەتەواوی قەوارەی خۆی دەکا.

❊ ❊ ❊

هەر بەمەش نیە کە ژن کەسێتی خۆی دەدۆزێتەوە. چونکە ژنیش -هەروەك پیاو- مافی ئەوەی هەیە کەسێتی خۆی بدۆزێتەوە بەوەی -بەهەڵبژاردنی خۆی- ببێتە ئافرەتێکی رەوشتبەرز.

رەوشتبەرزی لە کۆمەڵگەی موسڵماندا بەدەمی شمشێر بەسەر ژندا فەرز نەکراوە هەروەك بەخەیاڵی خەڵکانێك دادێ. ئەوەی بەشمشێر فەرز دەکرێ رادەی هەرە نزمی رەوشتبەرزیە -ئەو هێندەی کە کۆمەڵگە ناتوانێ بێ ئەوە بژی، ئەم هێندەش-لە کۆمەڵگەی موسڵماندا- بەسەر پیاویشدا فەرزکراوە بەهەمان ئەو برەی بەسەر ژندا فەرزە. جا چ لە یاسادانان بێ چ لە ئاراستەکردن:

﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ: داوێن پیسانی پیاو و ژن هەریەکەیان بە لێدانی سەد تازیانە تەمێ کەن.﴾النور/٢.

﴿قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ، وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ: تۆ بە پیاوانی باوەڕداران بڵێ: چاو داخەن و شورەیی خۆ بپارێزن. ئەمە

---

[1] ئەمە لایەنێکی مافی بەردەوامی خۆیەتی لە جوایەزبونەوە لە مێردەکەی ئەگەر نەتوانێ لەگەڵی بژی. بروانە بەندی (الاسلام و المرأة) لە کتێبی (شبهات حول الاسلام).

بۆ ئەوان باشترە و خوداش ئاگای لە هەمو ئاکاریان هەیە. بە ژنانی باوەڕداریش بێژە با چاویان داخەن و شەرمی خۆیان بپارێزن.﴾النور ٣٠-٣١.

تەنانەت ئەو هێندەش کە بە زەبری چەکی یاسا فەرزکراوە، چ پیاو چ ژن مافی ئەوەیان هەیە هەڵوێستی خۆیانی تیادا (هەڵبژێرن) جا بە هەڵبژاردنی خۆیان رەوشتبەرز بن نەك بەزۆری، بە بڕوایەکی راستگۆ نەك بە ترس و تۆقین لە سزا.

ئائەمەیە کە بڕوا لە دەرونی بڕواداران دروستی دەکا.

بەڵام رەوشتبەرزی زۆر لەم سنورە (رەسمی)ە فراوانترە کە بریتییە لە کەمترین رادە و ئەگەر ئەو رادەیە نەبێ کۆمەڵگە لە بنچینەوە دادەروخێ. بەڵکو بنیاتی تێکڕای دەرون و، هەمو هەڵسوکەوت و هەمو هەستێك دەگرێتەوە.

جا لێرەدا (مرۆڤ) -پیاو بێ یا ژن- مافی ئەوەی هەیە بە هەڵبژاردنی خۆی رەوشتبەرز بێ. وەك بەرزبونەوەیەك لە داکەوتن و هەڵزەلین بۆناو قوڕ و چڵپاوی رەوشت نزمی.. جا لەو کاتە زۆر بەتوندی هەست بەوە دەکا کە مرۆڤە و، خاوەنی بونێکە لە فراوانترین چێوەدا.

ژن مافی هەیە کە درۆ نەکا.

درۆش رەوشتێکی نزمە لە یاسای سەر زەوی سزای لەسەر نییە. جا کاتێك ژن خۆی لە درۆکردن دەپارێزێ، لەترسی سزا نیە، بەڵکو وەك خۆ بەرزگرتن لە کەوتنە نێو رەوشتنزمی و، بۆ دورخستنەوەی قەوارەی موسڵمانی لە دابەزین و دورکەوتنەوە لە رێگەی خودا.

هەروەها مافی هەیە جاسوسی نەکا و

مافی ئەوەی هەیە تانە و تەشەر نەهاوێ و

مافی ئەوەی هەیە خەڵەتاندن و فێڵ نەکا.

-بەکورتی- مافی ئەوەی هەیە کە لە رەفتار و هەست و هزر و جوڵە و ئۆقرەیدا راستەرێ بێ..

جا ئەوکاتە هەست دەکا کە ئەو (مرۆڤ)ە و، هەمو بەهاکانی سەر زەوی لە دەرونیدا گچکە دەبنەوە و، هەست بەبونیان ناکا لەبەرامبەر قەوارە گەورە وەدیهاتوەکەی خۆیدا.

* * *

بەر لەهەمو ئەو شتانەش ئافرەت مافی ئەوەی هەیە خاوەن بیروباوەڕ بێ. بیروباوەڕێکی ئیجابی چالاکی کارا.

بیروباوەڕی ئیسلامی بەخۆی بیروباوەڕێکی جوڵاوە و ئۆقرەی نیە. هەر کە لە دەروندا شوێنی رەوای خۆی گرت، یەکسەر رەهای دەکا.. بەهەمو ئاراستەیەکدا رەهای دەکا.

هیچ هەستێکی ئیجابی وانیە قەوارەی مرۆڤ چالاك بکا و بونی بەدی بێنێ و، هیچ چارەسەرێکی هاوشێوە نیە بۆ هەمو نەخۆشیەکانی دەرون. چارەسەری بۆ لاوازی و کورتبڕی و سلبیەتی. چارەسەری گرێوگۆڵ و نەخۆشی و شپرزەییەکانی.

جا بۆیە کۆمەڵگەی موسڵمان -بەڕاستی- لەهەمو کۆمەڵگەکان نەخۆشی دەرونی و شپرزەبونی دەمارەکانی کەمترە. چونکە ئەو رەهابونە ئیجابیەی بیروباوەڕ دروستی دەکات، وزەی خەفەبونی نێو مەکۆکانی دەخاتە دەر و لە پێناو چاکە هەڵیدەرێژێ و بەتاڵی دەکا، بۆیە دەرون هەست بە خەفەبون ناکات و وزەیەکی بەندبو نادۆزێتەوە پێویستی بە ئازاد بون هەبێ، کە زۆربەی جار ئازادبونێکی خوار و خێچە.

ئیجابیەتیش گەلێك جۆر و بواری جیاجیای هەن. لە چوار چێوەیەکی دیاریکراو

پەنگی نەخواردوە، تەنیا بریتی نیە لــە کـردەوەی مـاددی. بـەڵکو هـەمو کـار و کردەوەیەکە و، هەمو بیرۆکە و هەمو هەستێکە و. هەمو چرپەیەکی ویژدانە.

تەنیا کە مرۆڤ ئاراستەیەکی دیاریکراوی بەرامبەر شت و روداو و کەســـەکاندا هەبێ. تەنیا گەر راوبۆچونی هەبێ. تەنیا گەر پێوەرێکی هەبێ شتەکانی پێ بپێوێ و حوکمی خۆی لەسەر دەربکـا.. ئەمــە بەتـەنیا ئیجابیـەتێکی گـەورە بـە دەرون دەبەخشـێ، کـە شـوێنەواری لـە هەسـتەکاندا دەردەکـەوێ هـەروەك لـە قســە و کردەوەکاندا روندەبێتەوە..

جا بیروباوەڕ ئەمە دروستدەکا. ئەو پێوەرە دەداتە مرۆڤ کە حوکمی شـتەکان و روداوەکان و کەسەکانی پێ بکا. ئەو ڕاوبۆچونەی دەداتێ کە دروسـتی دەکـا، ئـەو رایانەش لە وەرامی ئارەزوەکانی دروست ناکا (چونکە ئەمە سلبیە هەر چــەند بـە ئیجابیش دیار بێ) بەڵکو بە محەکێکی بابەتیانە دەبێ کە پێڕاگەیشتویی کەسـێتی و توانای جیاکردنەوەی تێدا بەدی دەکرێ.

ئەم گۆڕەپانەش بە تەواوەتی لەبەردەم ئافرەتدا کراوەتەوە بەقەدەر ئەوەی کە بـۆ پیاو کراوەتەوە، ئافرەتی بڕواداریش -حەز بکا یا حەز نەکا- هەر دەبــێ کەسـێتی ئیجابی بەرامبەر شتەکان هەبێ، چونکە ناتوانێ شتێك قبوڵ کــا کــە پێچەوانــەی بیروباوەڕ و حوکمی خۆی بــێ لەســەر شــتەکان. ئەگــەر ئــەو شــتە لــە نێزیکـترین کەسیشەوە بێ: خـزم و کـەس یـا مـێردی یـا منداڵـەکانی. هـەردەبێ رای خـۆی بەرازیبون یا نارازیبون دەربڕێ لە بارەی هەمو ئەو شتانەی دێنە بەردەمی.

جا لە پاش ئەمە هیچ شتێك نیە رێگــەی جیـهادی لــێ بگـرێ لـەپێناو ئـەم بیروبـاوەڕە کـاتێك مەسـەلەکە پێویسـتی بـە جیـهاد دەبـێ.. جیـهاد بەهــەمو ئامرازەکان هەتاکو مەیدانی جەنگیش.

* * *

هەروەها مافی هەستکردنی بە کەسێتی خۆی هەیە بە ئیجابیەت و کاریگــەری لەســەر منداڵــەکانی. لــە پــەروەردەکردنیان لەســەر بیروبــاوەڕ و بــەرەو راســتەڕێ ئاراستەکردنیان.

ئافرەت لە عورفی ئیسلامیدا ئامێری منداڵبونی و دایەنی و شــیرپێدان نیــە.. ئەگینا ئیسلام هێندە مکوڕ نەدەبو لەسەر گۆشکردن و فێرکردن و بەهێزکردنی بڕوا لە ویژدانی ئافرەت لەگەڵ دابینکردنی دەســتەبەری بژێــوی و یاســایی و دەرونــی و رۆحی بۆ دامەزراندنی قەوارەکەی.

ئیسلام ئەو هەمو هەوڵ و ماندوبونە بۆ پەروەردەکردنی ئافرەت-پەروەردەکردنی پیاویش- خەرج ناکا تەنیا لەپێناو هەردوکیان وەکو دوتــاك کــە ماوەیــەك لەســەر زەوی بەسەر ببەن و تێپەڕن.

نەخێر! گەر مەسەلەکە بەم بارە بێ، ئەو هەمو ماندوبونە ناهێنێ.

بەڵکو ئیسلام هەمیشە حیساب بــۆ نــەوەکانی داهــاتو دەکــات کــە نــەوەکانی ئەمڕۆ پەروەردەیان دەکەن. بۆیە زاخــاوی ئــەمڕۆ دەدا هــەتا ســبەی -هەمیشــە- بەرهەمەکەی پاك بێ.

بۆیە لەمەدا گرنگی بە پیاو و بەژن دەدا وەك باوك و دایکی بەرهەمە نوێیەکە. بەڵام بەتایبەتی گرنگی و بایەخ بە ژن دەدا چونکە دایــك بنیاتنــەری راســتەقینەی نەوەکانە. جا پاشان باوك بەشداری دەکا و. رەنگە پاشان بە تەنیا -یا بەشێوەیەکی سەرەکی- کارەکە لە ئەستۆ بگرێ. بەڵام مۆرکە ســەرەتاییەکانی دەرونــی منــداڵ، ئەو مۆرکانەی کە هەر لە کۆرپەلەییــەوە لــە نــاخی هەســتی دەچەســپێ و، دواتــر کەسێتیەکەی دروست دەکــا، زۆرترینــی ئــەو مۆرکانــە لــە دایکیــەوە وەردەگــرێ، بەحوکمی ئەوەی کە بە هەست و نەستەوە بەدایکیەوە نوساوە، بەلای کەمی هــەتا بەپێ دەڕوا و، بازنەی ئەو (کۆمەڵگە)یە فراواندەکا کە تێیدا دەژی!

لەبەر ئەوەیە ئیسلام دەستەبەریەکانی ژیانی بۆ ژن دابینکردوە و، ناچاری نەکردوە بۆ بەخێوکردنی خۆی و خێزانی کار بکا. تاکو بۆ ترسناکترین ئەرك لە ژیانی مرۆڤایەتیدا تەرخان ببێ کە: ئەرکی بەرهەمهێنانی مرۆڤ و، چاودێری وپارێزگاری کردنیەتی لەگەندبون.

گێلایەتیەکی گەورەیە -لەسەردەمی پسپۆری و تایبەتمەند بوندا!- کە ئافرەت تایبەتمەندێتیەکەی لێ بسێندرێتەوە کە هەر بەخۆی تیایدا شارەزایە، تا لە بەرهەمهێنانی ماددی بەژدار بێ، کە پیاو دەتوانێ ئەنجامی بدا و، مادده و ئامراز دەتوانن ئەنجامی بدەن!

پێشتر باسی ئیجابیەتیشمان دەکرد..

هەروەها ئافرەت بۆی هەیە هەست بە ئیجابیەتی خۆی بکا و لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا قەوارەی خۆی وەدی بێنێ. دەڵێین لە پەروەردە نەك تەنیا منداڵبون و دایەنی و شیرپێدان، کە هەمو پشیلەیەك و هەمو مانگایەکی شیردەر ئەنجامی دەدا.

پەروەردە.. پێکهێنانی دەرونی منداڵان.. تۆوی بیروباوەڕی راست لە خاکو خۆڵێکی تازە.. چاندنی شەتڵە نەمام لە شوێنێکی تازە.

ئەمە هەوڵێکی گەورە و دور و درێژی پڕماندبونە. هەوڵێکی ئیجابیشە کاتێك ژن بەچاکی جێبەجێی دەکا.. هەروا ژن مافی چاکەکاری هەیە!

* * *

ئەمەش مانای وانیە ژن کار نەکا!

ئیسلام کارکردن قەدەغە ناکا.. هەمو مەسەلەکە ئەوەندەیە کە بە ئیشوکاری ئافرەت مورتاح نیە و وەك زەرورەتێك بە دروستی دادەنێ. بەڵام نایکاتە بنەڕەتی

شتەکان.

لە سەرەتادا ئەوەی لا مەکروهە کە تاقــەت و وزەی ئـافرەت لـەبواری دیکـەی غەیری بوارە رەسـەنەکە بخرێنـە کـار و، دوەمجار لـەلای مەکروهـە کـە مێشـکی بەکارکردن ماندو بێ، جا برێکی رەونەقداری پرشنگداری بەنمەی تێدا نـەمێنێ کـە کەش و هەوای ماڵی پێ ئاودار بکا و، بەسیحری تازەبوەوەی جلەوی بگرێ. کاتێك ژنیش ئیش بکا ئەوا -وەکو پیاو- بە هیلاکی و مێشك ماندویی دەگەڕێتەوە، جـا قۆچانێ لەگەڵ پیاوەکەی دەکـا و، پێکـەوە نـاگونجێن و تێـك ناگـەن و. سـەرەڕای ئەمەش منداڵەکانی وا هەست ناکەن دایکێکیان هەیە. وەك بڵێی دایــك و بـاوکی هەردوك نێرینەن!

بۆیە ئیســلام مکـوڕە کـە زامنـی پێداویسـتیەکانی ژیـان بـۆ ژن بکـا بـەبێ ئاتاجبونی بۆ ماندوبون و کار و نان پـەیداکردن. ئەگـەر چـی لـە کـاتی پێویسـت بونیش ئیشی لـێ حەرام نەکردوە و ئەمەش بەردەوام لە ئارادایە!

هەرچی لەوکارانەشە کە بە ژنـان تایبـەتن وەك: مامۆسـتایی و پەرسـتیاری و نوژداری ژنان.. لێرە کارکردن تەنیا بە دروست دانانــێ، بـەڵکو فـەرزی دەکـا وەك فەرزکردنی سەربازی کردن بۆ پیاوان.

❊ ❊ ❊

زانستیش فەرزە.. ئەم فەرزەش سنوری نیە.

بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئـافرەت لـە سـەرەتادا دەبـێ ئـەوە فێربـێ کـە لەگـەڵ فریشکیدا دەگونجێ و، بۆ ئەرکی هەرە گەورەی پێگەیاندنی نەوەکان دەیسازێنێ و، پاشان -ئەگەر ویستی- هەرچی بیەوێ بێ هیچ گرێ و گۆلێــك دەیخوێنــێ و فـێری دەبێ..

ئەمەش پەلکێشمان دەکاتە نێو بابەتی تێکەڵاوبون.. چونکە کاتێك لــە زانکـۆ بخوێنێ ئەوا لەگەڵ لاوان تێکەڵ دەبێ.[1]

منیــش -بەدڵسـۆزیەوە- هــەوڵم دا برِوبیــانو بــۆ رێگــە پێدانــی تێکــەڵاوبون بدۆزمەوە!

ئەو بیانوانەم خوێندەوە کە دەیانڵێن و ویستم بەلای بەراستدانانیاندا بشکێمەوە! سەربردەی بیرازکردنم[2] خوێندەوە!

کۆمەڵگـەی تێکـەڵاو بـیراز و مشـــتومالّی هەســـتە سێکســـیەکان دەکـــا و دایاندەمرکێنێ. چونکە ئەو برسیەتیە سێکسیە کافرەی تێدا نامێنـــێ کــە دەبێتــە مایەی لارِێبون و ریزپەرِی. هەروەها کاتێك گەنجێك لەگەڵ کچێك یەکتر دەبینن و، هەردوکیان لەیــەکتر دیــتن و چاوپێکـەوتن دڵارام دەبـن و، گـرِی حـەز و چاوبـازی دادەمرکێ، چیدیکەش سێکس نابێتە خەمی یەکەم و هێندەی پێوە خەریك نابن و، کـورِ و کچـــی لاو لـــە غـــەریزەی ئاژەڵانـــە بـــەرزتر دەبنـــەوە، چونکـــە لـــە چاوپێکەوتنەکەیاندا بە باسوخواسی زانســـتی و وێژەییـــەوە خـــەریك دەبـن، لەگـەڵ گفتوگۆکردنی مەسەلەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هزری.. شـــتگەلێکی بـەدەر لــە چوارچێوەی سێکس.

کاتێك لاویش لە کۆمەڵگەیەکی تێکەڵاو دادەبێ قسە و گفتی جــوان و شـیرین دەبێ و، ئەو قسە بێ پەردانە ناکا کـــە لــە کۆمەڵگــەی کورِانـدا رێ بــەخۆی دەدا بیانکا..

---

[1] بنەرِەت لە دیدی کۆمەڵگەی ئیسلامی ئەوەیە کە زانکۆی ژنان هـەبێ، بـەڵام ئێمـە وا گریمـان دەکەین کە خوێندن بە تێکەڵاوی زەروریە.

[2] بیرازکردن: تهذیب.

کاتێك کچیش لە بینین و هاوڕێیەتی پیاو رادێ، وێنەی پیاو لە دەرونیدا دەگۆڕێ و، چیدی وەك گورگێکی درندە، یا ئاژەڵێکی سەیر، یا بونەوەرێکی تۆقێنەر.. یا جەستەیەکی تینوی سوتاو بۆ جەستەیەکی برسی نامێنێ.

کاتێك هەردو رەگەز بەیەك دەگەن هەریەکە شارەزای سروشتی ئەوی دی دەبێت و.. چاوپێکەوتن لەسەرەتای هاوسەرێتیدا نابێتە شتێکی لەناکاو کە مێشك سەرسام بکا و عەقڵ شپرزە بکا.

کاتێك کوڕی لاو ژنان دەبینێ و لە کۆمەڵگەدا لە گەڵیان تێکەڵ دەبێ ئەو خاڵیکردنە[1] سێکسیە پاکە دێتە ئارا کە بارەکە لەسەر مێشك هەڵدەگرێ و لاوەکە وا لێدەکا بۆ بەرهەمهێنان دەستی بەتاڵ بێ جا: خوێندکار یا فەرمانبەر یا کرێکار بێ..

کاتێك کچیش پیاوان دەبینێ و لە کۆمەڵگەدا لەگەڵیان تێکەڵ دەبێ، هەمان ئەو خاڵیکردنە رودەدا، جا چیدی کچ هەمو وزە و توانای خۆی لە خۆڕازاندنەوە خەرج ناکا هەتا پیاوانی پێ راو بکا و، چیدی ئەو راوە نابێتە گرێکوێرەی بەردەوامی خەمی.

کاتێك و.. کاتێك و.. کاتێك..

لە دەرونی خۆم ویست باوەڕ بە هەمو ئەمانە بکا و بەڕاستیان بزانێ.. بەرەو باوەڕپێکردنیش چوم!

پاشان بەدوای ئەو وێنە جوان و ناسك و بەرز و باڵایەدا گەڕام.. لەکوێ هەیە؟ لە کوێ هەیە تا بیبینم و لە واقیعی سەر زەویدا باوەڕی پێ بکەم نەك لە خەون و خەیاڵان؟

---

١ خاڵیکردن: تصریف.

لە رۆژئاوا؟ لە رۆژهەڵات؟ لە میسر؟ لە چ وڵاتێك لە وڵاتانی سەرزەوی؟

ئایا ئەمریکا خەفەبونی سێکسی تێدایە بەهۆی تێکەڵاونەبون؟

ئەدی بۆ پڕاوپڕی (کارەساتی) رەوشتیە.. کارەساتی وا کە گەیشتۆتە رادەیەك تەنانەت خودی ئەو کۆمەڵگە شلۆقە بە کارەسات ناویان ببا و، بەدوای چارەسەردا بگەڕێ؟

ئەدی بۆ وا پڕاوپڕی رێژبەری سێکسیە[1]؟

ئەدی بۆ پڕ کارەساتی تەڵاقە کە رێژەی لەهەر وڵاتێکی دیکە زیاترە لەسەر روی زەوی.. بەمیسریشەوە!

ئایا وڵاتانی سەروی ئەوروپا تێکەڵاوی یان بێزارکردن، یا هاوسەنگی ئابوری، یا سەقامگیری سیاسی، یا هەر مەسەلەیەکی دیکەیان تێدا کەمە؟

ئەدی بۆ لێکترازانی رەوشت لەوێ تا ئەوپەڕی چوە؟

قوتابی کچ بەخۆی دەچێتە ماڵی قوتابیان (بەشەکانی ناوخۆی کوڕان) هەتا.. لەنێو جێدا لەگەڵیان بخوێنێ! پێش ئەوەی بشچێ -ئامراز و ماددە و حەبی منداڵ نەبونی پێیە!

بەشێوەیەکی کاتیش.. باسی رەوشت ناکەم.

تەنیا لە روانگەی دەرونیەوە باسی مەسەلەکە دەکەم.. ئەو تێربونە لە کوێیە کە تێکەڵاوبون وەدی دەهێنێ، کەجێی کردەوەی سێکسی تەواو بگرێتەوە، بەڵکو جێی

---

[1] لە کتێبی (الانسان بین المادیة و الاسلام) دەڵێم: بڵاوبونەوەی ریزپەڕی سێکسی لە فەرەنسا و لە ئەمریکا کە هەموو بوارێکی سێکسیان رەخساندوە و هەمو ئامرازێکیان بۆ دابینکردوە، مەسەلەیەکە سەرنج رادەکێشێ، وێدەچی ریزپەڕی سێکسی لەم حاڵەتەدا وەك جۆرە گۆڕانکاریەك بڵاو ببێتەوە!

دەستبلاوی تێدا دەگرێتەوە؟

ئەوەی لە ئەوروپا و ئەمریکادا رویدا پێچەوانە بو. شێت و هاربونێکی سێکسی رویدا. ئەوەی نەما هەر ئەو (تەڵەکەبازی)ە بو بۆ دەستخستنی رابواردنی حەرام لەگەڵ چاوبازی و گێچەڵکردنی سەرەڕێ و، ئەمە لە پاکی نیە کە نەماون، بەڵکو لەبەر ئاسانی و بەردەستی نەماون!

جا ئایا ئێمە ئەوەمان دەوێ؟ یان ئەمەیە کە بانگەوازی بۆ دەکەین. ئەگەر لە بانگەوازەکەماندا دڵسۆز بین.

ئایا بیرازکردن لە عورفی ئێمەدا ئەوەیە کە لە رۆژئاوا دەیبینین؟ ئایا کاتێك گێچەڵ نەمێنێ وا دادەنێین کۆمەڵگە پاك بۆتەوە و، ئێمە رەوشتبەرز بوین؟ ئەگەر چی هەندێك جار ماڵەکان و یانەکان و شەقامەکان ببنە فاحشەخانە؟!

لەهەمو مێژودا تێکەڵاوبون بێجگە لەو ئەنجامە چیدیکەی نیە.. لە ئەثینای کۆن و رۆمای کۆن و فارسی کۆن و هیندی کۆنیش هەروا بوە.. ئەمڕۆش لە پاش سەدان ساڵ لە پێشکەوتن و (گەشەسەندن) و شارستانی هەر وایە.

کاتێکیش ئەو هەمو (زیان)ەش لە تێکەڵاونەبون دەکەوێتەوە، دەخەمە تای تەرازو لەگەڵ ئەو (بیرازکردنەی) تێکەڵاوبون دروستی دەکات، ئەوا من بەبێ هیچ دو دڵی و پێویستی بۆ بیرکردنەوەیەکی زیاتر ئەوەی یەکەمیان هەڵدەبژێرم!

* * *

لەگەڵ ئەوەی کە ئەو حیجابە تورکیە[1] لە بیرۆکەی ئیسلامدا مەبەست نیە کە یەکسەر وێنەکەی دێتە بەر چاوان.

---

[1] مەبەست لە حیجابی تورکی ئەو جۆرە عەبا و باڵاپۆشەیە کە پێشتر ژنە قەدیمەکان، بە تایبەتی دانیشتوانی قەلات دەیانپۆشی.. —وەرگێڕ—

مەبەست ئەوە نیە کە ژن بە تەواوی لــە پیــاوان بزربــێ تــاکو هــەمو خایاڵاتــە نەخۆشەکانی خەریك بکا.. یان پیاو لە ژنان بزربێ.

مەبەست تەنیا ئەوەیە کە پەیوەندیەکی (تایبەت)ی لەگەڵ دروست نەکا کە بــە پەیوەستێکی شەرعی ئاشکرای زانراوەوە پەیوەست نەبێ.

جا ئەم دەرگایەیە کە شەیتانی لــێ دەچێتە ژور و، هەرگیز لێی دەرناچێ.

ژن دەچێتە دەرێ و پیاوان دەبینێ و دەیبینن.. بە مەرجێك کە روت نەبێ و بــۆ فریودان و راوکردن و لە داوخستن چوبێتە دەر.

دەرچون بەخۆی قەدەغە نیە.. بەڵکو ئامانجەکەی جێگەی پرسیارە. بۆ خوێنــدن دەچێتە دەر؟ بۆ کارکردن دەچێتە دەر؟ بۆ رۆژ و هــەوا دیــتن دەچێتــە دەر؟ بــەڵێ. ئەمە هەموی موباحە. هەموی پاکە. هەموی شەرعیە. بەڵام ئەگــەر لــە نــاوەوەی هەستیدا وروژاندنی فیتنە و رێگرتنی مێینە بێ بە نێرینە و. زانســت یــا کــار یــا گەشتوگوزار پەردەی ئەو شتانە بن.. لێرەدا رێی لــێ دەگیرێ، چونکە ئەمە بریتیــە لە سەرەتای ئەو رێگەیەی کە کۆتاییەکەی لە رۆژئاوای لەباریەکچو و لە رۆژهەڵاتی خەڵەتاودا دەبینین.

ئافرەت لەگەڵ پیاو مامەڵە دەکــا و بــە پێچەوانــەش.. قســەش لەگــەڵ یــەکتر دەکەن و، گفتوگۆی یەکتریش دەکەن و، یەکتری رێنوێن دەکــەن و، ئــەو خزمەتانــە ئاڵوگۆڕ دەکەن کە پێداویستی ژیانن، لەو کەش و هــەوا پــاك و لەبــەرچاوەدا، کــە فریودانی لە پشت حەشار نــەدرێ و، پێکــەنین و عیشــوە و غــەمزە و نــاز و لار و لەنجەی و چاوبازی تێدا نەبێ.

ئامانجگەلی پاك و رەفتاری پاك.

❊ ❊ ❊

ئەدی هەست و سۆزی ژن؟ ئایا موڵکی خۆیەتی؟

ئایا هەستی فریشکی بەرامبەر رەگەزەکەی دیکە نابزوێ؟

ئایا چاوی ناکەوێتە سەر پیاوێکی دیاریکراو، کە باشی بێتە بەرچاوی، کە دڵی بگرێ و، حەزی لێبکا؟ ئایا ئەو کاتە هەڵوێستی لە کۆمەڵگەی موسڵماندا چۆن دەبێ؟

ئیسلام سیستەمێکی جیددیە..

بەڵام جیددیەت مانای ترش و تاڵی و نێوچەوان تێکنان نیە لە بەجێگەیاندنی کاروبارەکاندا! پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((**روحوا قلوبكم ساعة فساعة**: سات نا سات دڵەکانتان بحەسێننەوە.))رواه أبوداود عن أنس. هەروەها هەر کاتێك خەڵك پێغەمبەر ﷺیان دەدیت، روگەش و دەم بە زەردەخەنە بو لە رویاندا.

بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە مەسەلەکان بەجیددی و بێ پینەکردن و بێ‌روتەمەنی و بێ‌خوار و خێچ کردن وەردەگرێ.

هەستوسۆزیش لەدیدی ئیسلامدا دەبێ بەجیددی بێ و، هەر بۆیەشە کە رێزی دەگیرێ.

خۆشەویستی جیددی و ئیعجابی جیددی و دڵبۆچونی جیددی و.. هەستوسۆزی جیددی.

قورئان لە کچی شوعەیب دەگێڕتەوە، کە کچە پێغەمبەر بو، بە موسا (عليه السلام) سەرسام بو، ئەو سەرسام بونەشی بۆ باوکی دەربڕی بە شێوازێکی زۆر ساکار و بێ گرێوگۆڵ و ناز و گۆز و خۆ بادان: ﴿**يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنِ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الْأَمِينُ**: باوەبەکرێی بگرە، چاترین رەنجبەر ئەوەیە بەتاقەت و جێ‌باوەڕ بێ.﴾القصص/٢٦. ئەوجا باوکی دەیدا بە موسا (عليه السلام).

ئەوەی قورئانیش دەیگێڕێتەوە ئەو نمونەیە کە حەز دەکا خەڵکی تێدا بژین. چونکە قسەکەی بە خراپ دانەناوە و، ویستویەتی بەراشکاوانە گوزارە لە ئیعجابی خۆی بکا و، نەیکردۆتە نهێنیەکیش کچە لە دڵی خۆیدا هەڵیگرێ و لای کەس و کاری نەیدرکێنێ.

خێزانیش لە کۆمەڵگەی موسڵماندا خێزانێکی موسڵمانە. هەر خێزانێکی تێکگەیشتو و ئاریکار و پێکەوە پەیوەست خۆشەویستی دایدەپۆشێ و، لەسەر راشکاوی رێزگرتن یەکدەگرنەوە و، لەم کەش و هەوا پڕ سۆز و خۆشەویستیە خاوێنە راشکاوە، کچ دەتوانێ هەستو سۆزە بەراستیە پاکەکەی خۆی باس بکا کە هیچ شتێك پیسی نەکردوە. جا دەبێتە جێگەی رێز یا ئامۆژگاری یا تێکگەیشتن لەهەمو بارێکدا.

* * *

بەڵام ئیسلام پیسی قبوڵ ناکا.

ئەو پیسیەی ناویانناوە خۆشەویستی و، بریتیە لە شاڵاوی سێکسی برسی و تینو.. ئەمە لەگەڵ بیرۆکەی ئیسلام لە بارەی (مرۆڤ)ەوە یەکناگرنەوە.

ئیسلام هاندەرە فریشکیەکان بەکەم دانانێ و خەفەی ناکا و بەپیسی تێناگا. سێکس بەخۆی پیس نیە و حەرامیش[1] نیە. بەڵام مەرجی ئیسلام گەڕانەوەیە بۆ فریشك: چنگە قوڕ و فوە رۆحەکە. نە ئەمەیان بە تەنیا و نە ئەویان. نە جەستەیەکی ئاژەڵی تینو.. نە گیانێکی پاکیزە و رەبەن[2]. هەردوکی حەرامە.

---

١ بەوردی بگەڕێوە بۆ (المشکلة الجنسیة) لە (الانسان بین المادیة و الاسلام).

٢ پاکیزە: بتول. رەبەن: راهب.

هەروەها ئیسلام رێ بە هاوسەرێتی دەدا و بانگـەوازی بـۆ دەکـا و لای خـەڵك خۆشەویستی دەکا.

جا لە هاوسەرێتیدا سێکس دەرفەتی سروشتی خۆی دەدۆزێتەوە، بەڵام بەرێگەی فریشکی ساغ و سەلامەت دەیدۆزێتـەوە. دەبینـێ کـە بـە ئامـانجێکی بـەرزترەوە پەیوەستە و، بەخۆی ئامانجی داواکراو نیە.

* * *

جا لێرەدا دەگەینە گیروگرفتی کوڕی رەبەن و کچی عازەب[1]

گیروگرفتی (بێبەشبون).. چارەسـەریەکەی لـە ئیسـلامدا چیـە مـادام هـەمو پەیوەندیەکی سێکسی بێجگە لە هاوسەرێتی حەرام دەکەین؟

ئەو چارەسەرەی ئیسلام پێی باشـە بریتیـە لـە کۆمەڵـە قۆنـاغێك و کۆمەڵـە ئەنجامدانێك.

یەکەم: کۆمەڵگە لە هۆکارەکانی وروژاندنی هار و هاج پاکدەکاتەوە کە خوێنـی جحێڵان گـەرم دەکـا و ئارامگرتنیـان لەبەرامبـەر سێکسـدا دەکاتـە گرانـترین و دژوارترین کار. چونکە هیچ روتەمەنی نە لە رۆژنامەوانی و نە لە رادیـۆ و نـە لـە سینەما و نە لە شانۆ و نە لە چیرۆك و نە لە رێگەدا نامێنێ.

دوەم: ئامانجگەلی جیددی بۆ ژیان دروستدەکا کە وزەی دەرونی دەخاتـە گـەڕ و لە پیسی قەدەغە بەرزی دەکاتەوە.

سێیەم: پاشمـاوەی وزەی زینـدو بـە خـەریکبونی بـەردەوامی جەسـتە و دەرون بەکاردێنێ.چونکە کوڕ بە وەرزش (وەك سـوار چـاکی و جیـهاد) خـەریك دەبـێ و

---

[1] رەبەن: کوڕێ ژنی نەهێنابێ. عازەب: کچێك مێردی نەکردبێ.

كچيش بە ماڵداري، هەردوكيش ماندوبوني هەستەكان بەرز دەكەنەوە و تا ماوەيەك خەريكي دەكەن.

چوارەم: پەرستن دەكاتە بەشێك لە چالاكي زيندوي مرۆڤ و، ئەمەش دەكاتە ئامرازێكي بەرزوبالاّ بون و هەڵكشان.

لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا دەزانێ كە چارەسەري كاتين و بۆ ماوەيەكي درێژ خۆ ناگرن. بۆيە بڕياري هاوسەرگيري زو دەدا، بۆ كورتكردنەوەي ماوەي لەكار خستني سێكس كە هاندەرە بەرەو خراپە.

جا با لەمەدا راشكاوبين، هەروەك لە مەسەلەكاني ديكەشدا داواي راشكاويمان كرد.

بارودۆخي كۆمەلاّيەتي و ئابوري پڕ گرێكوێرەي ئێستا رێگە بە هاوسەرگيري زو نادات.

ئەمە راستە.. بەلاّم راستيەكي پابەندكار نيە و، واقيعێكيش نيە كە گۆڕاني بەسەردا نەيە.

گەنج لە ئەمريكا لە قۆناغي دواناوەندي كاسبي دەكا و خەرجي خۆي دەستدەخا و، پاشان يەكجاري ئەركي خۆي دەگرێتە ئەستۆ و ئەگەر ويستي ژن دێنێ و، دەچێتە زانكۆ و، پارە لە هەمو كاروبارێكي كە دێتە پێشي خەرج دەكا. سيستەمي خوێندنيش لەوێ سانايە بەشێوەيەك قوتابي دەتوانێ بخوێنێ و كار بكا و، هيچ يەكێكيشيان رانەوەستێ.

ئەوەي مرۆڤ لە ئەمريكا پێي دەكرێ مرۆڤي موسڵمانيش پێيياندەكرێ.

بەهەر حاڵ ئێمە باسي كۆمەڵگەي موسڵمان دەكەين و باسي واقيعي ئێستا ناكەين كە جێبەجێكردني بەشە وردەكاني ئيسلامي تێدا مەحاڵە.

کۆمەڵگەی موسڵمانیش ئابوریەکانی خۆی وا دەگونجێنێ کــە لەگــەڵ مەبدەئــە رەوشتی و مەبدەئە رۆحیەکانیدا[1] کۆك بێ، جا ئەمانە هەردوکیان پێــك دەگــەن و، مرۆڤ لە نێوان داخوازیە ماددیەکان و ئەو ئەرکانەی ئاین دەیخاتە سەرشانی پارچە پارچە و دابڕ نابێ.

رێکخستنی ئابوریش -لەگەڵ زەحمەتی و لەگەڵ ئەو هەوڵە مەزنە بەردەوامـــەی بۆی خەرج دەکرێ- مەحاڵ نیە و ئەگەر نیازمانِ هەبێ و بڕوامان وابێ کە زەروریــە دێتە دی..

* * *

بۆ مێرکردنیش کچ پێویستی بەوە نیە دابەزێتە بازار و خۆی پیشـــاندا هــەروەك کۆیلــەی ســپی پیشــانی کڕیــاران دەدرێــن. ئیســلام لەمــە پــتر رێــزی لێنــــاوە و پاراستویەتی. هەمو مافەکانی مرۆڤی بەتەواوی داوەتـــێ. مــافی ئــەوەی داوەتـــێ ئەگەر بیەوێ بۆ خۆی یەکێك هەڵبژێرێ، مافی ئەوەشی داوەتێ داخوازیکــار قبــوڵ کــا یــا رەتــی کاتــەوە، رەزامــەندی وەرگرتنیشــی کردۆتــە واجــب ئەگــەر نـــەبێ هاوسەرگیریەکە پوچ دەبێتەوە دروست نیە.

بەڵام ئیسلام حەز دەکا هەمو شتێکی تێدا پاك بێ.

مادام کچ دەچێتە دەرێ و دەخوێنێ و ئەگەر بارودۆخ بخوازێ کاردەکــا. کەواتــە ترسی ئەوەی نیە بەبەندکراوی بمێنێتەوە و پیاوێك نــەیبینێ. هــەرگیز لــە مێــژودا ئەمە روی نەداوە، تەنانەت لە سەردەمی حیجابی تورکــی تــەواویش کــە ژنــی لــە (حەرەمسەرا) دانابو.

[1] بڕوانە کتێبی (العدالة الاجتماعية في الاسلام).

کاتێك کۆمەڵگـەش پـاك و جیـددی بـێ ئـەوا هـەر دەبـێ ژن بێنـن.. مـادام رابواردنی پیسی ئاسانیان دەسناکەوێ کە جێگەی ژنهێنانیان بۆ پڕکاتەوە. هـەنگی ئەو تەنگژەیەی[1] ئێستا نامێنێ کە کچ ناچار دەکا خـۆی بـۆ راوی مـێرد دابەزێتـە بازاڕ.

پاشان ئەو گێروگرفتەی کە کۆمەڵگەی پیسی لە شاردا توشی دڵـەڕاوکێ کـردوە هەر لە خۆیەوە دەڕوا و نامێنێ، کاتێك ئێمە موسڵمان بین.

* * *

ماوەی دەزگیرانیش بەسە بـۆ لێکۆڵینـەوەی رەوشـت و تەبیعـەت و کەسـێتی، زەروریش نیە لێکۆڵینەوە بە ماچی بەدزی پـەنا و پەسـیوان بێـت. چونکـە ئەمـە کەڵەکەبازیەکە بۆ رابواردنی سێکسی بەناوی لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە!

کوڕە و کچە مافی ئەوەیان هەیە چاویان پێك بکەوێ و یەکتر بناسن و لە شـتان بکۆڵنەوە. بەڵام بە ئەدەبێکی بەراستی و بە ئامادەبونی کەسانی مەحرەم، نەك لـە شوێنی چاو نەدیودا.

کاروباری جیددی بەمشێوەیەیە.

جا ئەگەر بڕیاریـاندا دەتوانـن پێکـەوە پەیوەسـت بـن و کـوڕە مـارەی بکـا.. لەوساتەوەش دەبێتە ژنی و ئەگەر ویستی دەتوانی لە خەونە خۆشەکانی دەزگـیرانی چێژ وەرگـرێ کـە گـەنجانی ئـەمڕۆ زۆر لەسـەری مکـوڕن، بـۆ ئـەوەش ماوەیـەك گواسـتنەوە دوا بخـا و، پێکـەوە بچنـە دەر و گەشـت بکـەن بـە حـەڵاڵی خـودا و پێغەمبەرەکەی و بڕواداران رابوێرن.

* * *

---

[1] هەنگی: ئەوکاتە. تەنگژە: أزمة.

کاتێك کچیش مێرد دەکا و زگی پڕدەبێ و منداڵی دەبێ، ئیشوکاری یەکەمی دەبێتە ماڵەکەی و، چاودێری بەرهەمە مرۆڤانە تازەکە.

بەڵام ئەوە رێی چالاکی کۆمەڵایەتی جیددی و دڵسۆزانە و پاکی لێناگرێ. چونکە ئیسلام هیچ جۆرە پیسیەك قبوڵ ناکا، جا ئەو پیسیە ریاکاریەك بێ دەرون خۆی پێ دەرخا، یان گەندەڵیەك بێ لە زەوی، یا لە راستەڕێ دەرچون بێ.

جا کاتێك ژن لە ماڵی خۆی دەردەچێ هەتا لە ئاهەنگێکی سەماکردن ئامادەبێ و. کاتێك دەچێتە دەرێ هەتا پیاوی بێگانە ببینێ بۆ ئەوەی غەزەلخوانی بکەن و بە جوانی ویدا هەڵبڵێن و. کاتێك دەچێتە دەر بۆ ئەوەی وا بلاو بێتەوە کە لە بواری کۆمەڵایەتیدا کار دەکا و. کاتێك دەچێتە دەر بۆ سەردانی دەستە خوشکانی هەتا غەیبەتی خەڵکی بکەن و. کاتێك دەچێتە دەر تا گەندەڵی لەسەر زەویدا بلاوبکاتەوە جا بەهەر رێگایەك بێ، ئەو کاتە حەرامە بچێتە دەرێ، ئەگەر مێردەکەشی رازی بێ یان هانی بدا.

بەڵام کاتێك دەچێتە دەر تا لەگەڵ کچانی هاورەگەزی هاریکار بن بۆ چاکسازی کۆمەڵگە بۆ دامەزراندنی بیروباوەڕی دروست و پەروەردەی دەرونەکان و نەهێشتن و لەناو بردنی تاوان و جیهاد لەپێناو بیروباوەڕ.. ئەوا دەرچونەکەی حەلاڵە مادام سفوری تێدا نەبێ و لە سنور دەرنەچێ.

چونکە عیبرەت لە خودی دەرچونەکە نیە، بەڵکو لە ئامانجەکەی و لە شێوازی رەفتارکردندایە.

* * *

ئەوە رەوشی ئافرەتی موسڵمانە لە کۆمەڵگەی موسڵماندا و، ئەوە ئازادکردنی راستەقینەی ئافرەتە..

كاتێك ژنیش ئازاد بێ كۆمەڵگــە ئــازاد دەبــێ.. چونكــە ئــەو پــەروەردەكاری نەوەكانە.

هەرچی ئەو ئازادكردنەشە كە هەڵیانبەستاوە گوایە ئــافرەت لــە رۆژئــاوا پێــی گەیشــتوە و، ئــەوەی بانگــەوازكارانی ئــازادكردن بــە هــاندەری چاولێكــەری لـــە رۆژهــەڵاتی ئیســلامیدا بانگەشــەی بــۆ دەكــەن.. ئــەوە بـــــەرموزنكردنی[1] ژن و، بەرموزنكردنی پیاو، بەرموزنكردنی نەوەكانیشە.

بەهەر حاڵ رۆژئاوا بارودۆخی تایبەتی خۆی هەبوە كە پێشتر راڤەمان كردن، كە دابەزین و لاڕێبونەكەی لێكدەدەنەوە. خوداش ئێمەی توشی ئەو بارودۆخە خـراپ و روخێنەرانە نەكردوە، جا چۆن ستایشی خودا نەكەین بەوەی كە بۆ لای بگەڕێینــەوە ئەو رێیە بگرین كە بۆی هەڵبژاردوین؟

ئافرەتیش لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا لەبارێكی یەكجار خراپ دایە.

بارێكی وا دەبێ كار بۆ گۆڕانی بكرێ و هەمو هێزەكان بۆ ئەو گۆڕانــە تــەرخان بكرێن. بەڵام با شوێنی دەردەكان بزانین هەتا چارەسەر بدۆزینەوە.

ژن لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا، جگە لە كەمینەیــەكی هــەرە كــەمی دەگمــەن.. ژنێكی ئاژەڵە..

ئاژەڵێكە لە گوند و لادێیان لەناو قەپلێكی پیسی بەرهەســت و مەعنــەوی و.. كۆیلایەتی بۆ پیاو و، بۆ ئەو رەوشانەی لە كۆمەڵگەی مــردۆخ و پاشــكەوتودا لــە ئارادان..

لە شاریشدا ئاژەڵە. خاوێن و رێك و كەشخە و بــە لەنجــە و لارە. بــەڵام لەگــەڵ هەندێشدا ئاژەڵە، ئاژەڵێكە بۆتە بەندەی ئارەزوەكان.

---

[1] رموزنكردن: مسخ .

جگە لە کەمینەیەکی هەرە کەمی دەگمەن.. کە بە زانایی بڕوای بە خودا هەیە و.. بڕوای بەخۆی هەیە لەڕێگەی بڕوابون بە خودا.

لە لادێ ژنێکی نەفامی کۆیلە کە نە قەوارەی هەیە نــە حەقیقــەت. پیــاو وەك باوك و وەك برا و وەك مێرد و وەك خزم دەیکاتە کۆیلە.. تــەنیا ئەگــەر ئــەو ژنــە موڵکێکی هەبێ.. ئەو کاتە هەســت بــەخۆی دەکــا و شــانازی بــە بونــی دەکــا.. بەشێوازی ئاژەڵ.

لە شاریشدا ژن لە هەمو کۆتێك بەرەڵایە. خوێندویەتی و، خۆی رازاندوتــەوە و، روتبۆتەوە و هاوڕێەتی پیاوانی کردوە، (هاوڕێیەتی) جۆراوجــۆر و. وەك کرێکــار و فەرمانبەر ئیشی کردوە. لەبەری رەنجی دەستی خۆی داهــاتێکی دەســکەوتوە و. - بەروکەش- بەرامبەر پیاو سەربەخۆیە و لەژێر دەسەڵاتیان ئازادە.. پاشان..

پاشان -بەویستی خۆی- خۆی کردۆتە کۆیلە بۆ ئارەزوەکانی ئاژەڵ و، جــارێکی دیکە بۆ پیاو گەڕاوەتــــەوە، نــەریزی لای خــۆی هەیــە و نــە دەرونبــەرزی، بــەڵکو غەریزەی نزم هانی دەدا و ئەویش رێی رەفتاری ئاژەڵان دەگرێ.

ئەوجا رونە ئازاد نەبوە..

بەڵکو تەنیا لە جڵەو دەرچوە و، هێشتا مۆری کۆیلایەتی لە خوێنیدا ماوە.

ئازادی راستەقینە ئەو رۆژەیە کە مرۆڤ -بە هەردو رەگەزەکەی- دەرونی بــەرز دەبێ لە ئاست زەرورەت و هاندەری ئارەزوەکان و، دەیگۆڕێ بۆ رەفتــارێکی ئــازاد کە بەرزبونەوە و هەڵبژاردنی تێدایە.

جا ئایا ئەو کچەی خۆیڕازاندۆتەوە لە دەستی دێ بێ خۆڕازاندنەوە و بێ بۆیاغ و بەرجەستەکردنی شوێنەکانی فریودان بچێتە دەرێ.

ئایــا لــه دەســت خۆیــەتی بــۆ ســەرە رێ بچێتــە دەر و بــە راوی تیلـەچاوێکی موعجەبانە یا تێڕوانینێکی نزم خەریك نەبێ و بایەخی پێنەدا؟

هەمو ژنێك حەز دەکا مایەی سەرسام بون بێ، یان بــەلای کــەمی خــەڵك لێــی نەڕەونەوە.

ئەوەش هەستێکی سروشتیە و چ نەنگی و لاڕێییەکی تێدا نیە.

بەڵام (مرۆڤ) هاندەرەکانی ڕێکدەخا و تا سەری رێ لەگەڵی ناچێ.

ئەو ژنەی بەهەمو قەوارەی خــۆی حــەز دەکــا جێگــەی سەرســامی و جێگــەی ڕێزگرتن بێ، جیاوازە لەوەی تەنیا لە رواڵەتی جەســـتە کــۆی بکاتــەوە و، دەرۆزەی سەرسامی و وروژاندن و فریودان بکا.

یەکەمیان ئازادە و خاوەنی قەوارەی خۆیەتی و بەسەر کەسانی دیکەیدا فــەرزی دەکا، ئەوی دیکەش کۆیلەیەکە بۆ ئەو هاندەرانە لە قەوارەی خۆیدا هەن و کۆیلەیە بۆ کەسانی دیکە.

ئازادبونی راستەقینە کردارێکی زەحمەت و ئەســتەمە. گــەلێك ئــەرکی گــەورە دەخاتە سەر هەستەکان و رەفتار و هزرەکان. بەڵام ئازادبونی ساختە، بــەواتای لــە جڵەو بەرەڵابون، چەند ئاسان و سانایە.. ئــەو رۆژی کۆمەڵگــە دەگــۆڕێ و دەبێتــە کۆمەڵێك لە بەنی حەیوان!

پێوەری راستەقینەی ژنی (ئازاد)یش بریتیە لەو وێنەیەی لە هەستی ئەو پیاوەدا وەریدەگرێ کە لە کۆمەڵگەدا لە گەڵیدا دەژی. جا پیاو چۆن تەماشای دەکا؟ ئایــا بەڕاستی (ڕێزی دەگرێ). لەبەردەم و لە پاشملــە؟ یــا هــەر حــەزی دەچێتــێ و، وەك رابواردنێکی سەرجێ دێتە خەیاڵی؟

بەراستی ئەو پیاوە کەمە. ئەمیش –وەك ژنەکە- پیاوێکی ئاژەڵە.

بەلام ژنەکە -ئەگەر لەرێگەی بڕوابون بەخوداوە بڕوای بەخۆی هەبێ- لە دەستی دێ بەهای خۆی بەرزبکاتەوە و، بونــی ســەربەرزانە و قــەوارەی وەدیــهاتوی خــۆی بەســەر پیــاودا فــەرز بکــا. بــەلام کــاتێك خــۆی دەخاتــە بــەرچاوانی پیــــاو وەك جەستەیەکی تیختیخەدراوی رازاوەی بە لار و لەنجە، ئەوا نابێ چاوەڕێی شــوێنێکی گەورەتر بێ لە رابواردنی سەرجێ لە هەستی پیاودا.

❊ ❊ ❊

کاتێك ئافرەتیش بەوشــێوە راســتەقینەیە ئــازاد دەبــێ، پیــاو ئــازاد دەبــێ و، کۆمەڵگە ئازاد دەبێ و، نەوەکانیش ئازاد دەبن.

ئەمەش گەورەترین ئامانجە کە ئیسلام بۆ وەدیهێنانی تێدەکۆشێ.

لە کۆمەڵگەی موسلمانیش دا گەلێك گرێوگۆڵ دەبنەوە کە ئەمڕۆ دەرونەکانیان ئاخنیوە و، -هەر لە خۆڕا- زۆر گیروگرفت و کێشەش چارەسەر دەبن.

راستە هەمو کۆمەڵگەیەك گیروگرفتی خۆی هەیە.. بەلام. جۆری گیروگرفتەکان بە جیاوازی پلەی (بەرزێتی) و سروشتی ئامانجەکان دەگۆڕێ.

ئەو گیروگرفتانەی روبەڕوی کۆمەڵگەی موســلمان دەبنــەوە بریتــین لــە هــەولی بەردەوامی جێگیربون لەسەر بیروبــاوەڕ و بەرزبونــەوە لــە ئاســت پێداویســتیەکان. ئەمەش هەولێکی پڕماندوبونە و بە هەساوەیی واز لە مرۆڤ ناهێنــێ و، دەرفــەتی بۆ ناهێڵتەوە چەند چرکەیەك بێئاگا بێ.. بەلام هــەولێکی چــاك و رو لــە بەرزیــە، مرۆڤایەتی بەرەو بەرزتر دەبا لە هەمان ئەو کاتەی کە بەرەو پێشی دەبا.

کۆمەڵگەی لێکترازاویش گرێ و گرفت و ئازاری خۆی هەیە.. بــەلام هەولــەکان تیــایدا هــەولی بــەفیڕۆ چــون، چونکــە بەرێگــەی شــەیتاندا دەڕۆن و، تــەنیا تێڕوانینێکیش بۆ ئەو جیهانەی ئەمڕۆ ژیاری رۆژئاوا بەسەریدا زاڵە. ئەو جیهانــەی

لەهەمو ساتێکدا لەژێر هەڕەشەی وێران بونە، بەسە بۆ وەڵامی هەمو پرسیارێك.

ئەم کۆمەڵگە موسڵمانەش تەنیا بە موسڵمانان تایبەت نیە.. بەڵکو هەمو ئـەو مرۆڤزادانە دەگرێتەوە کە تێیدا دەژین.

بـەگوێرەی موسـڵمانان بیروبـاوەڕە و، بـە گوێـرەی غــەیری وان سیســتەمە. سیستەمێك لە سایەیدا بە ئاسایش و بە بەرزی و هەڵکشاوی دەژین و، بیروبـاوەڕی تایبەت بەخۆشیان پارێزراوە و دەستی کەسێ بەرناکەوێ.

# ئەوجـــا ...!

ئەوجا من دەزانم کە خەڵك تەنیا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە و هــەزار کتێبیــش نابنە موسڵمان.

نەخێر. چونکە ئیمپریالیزمی خاچپەرست و زایۆنی لە ماوەی دو سەدە گەمــەی نەکردوە!

هەر لەو رۆژەی ئیسلام لە دایکبوە دژایەتی لە نێوان ئیســلام و خاچپەرستــی و زایۆنیزم لە ئارادایە. هەر لەو ساتەوە کــە دەوڵــەتی ئیســلام لــە مەدینــە لەســەر دەستی پێغەمبەر ﷺ دامەزرا.

هەر لەو ســاتەوە تــا ئێســتا خاچپەرستــی و زایۆنــیزم تەڵــە و داو بــۆ ئیســلام دەنێنەوە و هەتا قیامەتیش هەر بەردەوام دەبن. خودای پەروەردگاری موسڵمانان و پەروەردگاری هەمو خەڵکی دەفەرموێ: ﴿وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلاَ النَّصَـارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ: ئەو جولەکە و فەلانە، تــا نەچیــە ســەر دینــی ئــەوان، هــەرگیز خۆشیان لەتۆ نایە. ﴾البقرة/١٢٠. ﴿وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُـمْ عَـنْ دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا: ئەوان دەستتان لــێ بەرنادەن، هەر لەگەڵ ئێوە بەشــەڕ دێــن، هەتا-گەر بۆیان بلوێ- ئێوە لە دینەکەی خۆتان وەر بگێڕن. ﴾البقرة/٢١٧.

جا لە چەندین نۆرە ئیسلام سەرکەوتوە و، جارجارەش خاچپەرســتی و زایۆنــیزم سەرکەوتن.

بەتایبەتیش لەو دو سەدەیەی دواییدا، کاتێك جیهانی ئیسلامی لێکجودا بـۆوە و پارچە پارچە بو، کاتێك رەق هەڵگەڕا و بوە بـەرد و لـە پێشـکەوتن بێـهێز بـو، خاچپەرستی و زایۆنیزم دەرفەتەکەیان قۆزتەوە و، بۆ پارچە پارچـە کردنـی (پیـاوە نەخۆشەکە) هێرشیان هێنا و پاش پەرشوبڵاوبونەوەی پارچەکانیشی قەپیان لێگرت.

هەر کەسێکی وا گومان ببا رۆژئاوا تەماعی کردبوە رۆژهەڵاتی ئیسلامی لەبەر سەرچاوە سروشتیەکانی، یان توانای مرۆڤایەتی، یا بە خولیای دۆزینەوەی بازاڕ بـۆ سەرفکردنی کەل و پەلە زیادەکانی، یا بەئارەزوی خستنەگەڕی (سەرمایەی مـاڵی) زیاد و دەسکەوتنی قازانجی پتر..

هەر کەسێك واگومان ببا تەنیا ئەوە بو رۆژئـاوای بـۆ ئیسـتعماری رۆژهـەڵاتی ئیسلامی هـاندا ئـەوە بابایـەکی سـاکاری وێلکـراوی خەڵـەتاوە.. بـەخودی ئـەو بانگەشەی خاچپەرستیەوە خەڵەتاوە کە هەڵوێستەکەی بەم شێوەیە دەرخستوە تاکو ئامانجە رەسەنەکەی لە چاوان بزرکا!

هەر کەسێکی گومانیشی لەوەدا هەیە کە هێرشێکی خاچپەرسـتی زایۆنـی دژە ئیسلام بو بەمەبەستی لەناوبردن و لـە رەگـەوە هەڵکێشـانی ئیسـلام.. بـا مێـژو بخوێنێتەوە!

با لە کتێبی (پرۆتۆکۆلەکانی دانایانی زایۆن) بخوێنێتەوە (تـەکتیك)ی جولەکـە چـۆن لەسـەر بنچینـەی لـەناوبردنی هـەردو بیروبـاوەڕی نـەصرانی و ئیسـلامی دامەزراوە، لەناوبردنیش بەهەمو ئـامرازێك، لەوانـەش بڵاوکردنـەوەی بیروڕاکـانی فرۆید و رێکارەکانی[1] مارکس. هـەروەها چـۆن تـەکتیك بـۆ کـاولکردنی جیـهانی ئیسلامی دانراوە بەتایبەتی بە دامەزراندنی (نیشتمانی قەومی) بـۆ جولـەکان لـە

---

١ رێکارەکان: تعالیم.

نێو دڵی جیهانی ئیسلامی تاکو ببێته خاڵی هێرشکردن و پێگـەی هـەنگاونان بـۆ وێرانکردن.

با ئەوەش بخوێنێتەوە چۆن سـەرۆك وەزیرانـی بـەریتانیا لـە رۆژی داگـیرکردنی بەریتانی بۆ میسر لە ساڵی ١٨٨٢ لـە ئەنجومـەنی گشـتی هەسـتاوە سـەرپێ و، قورئانێکی بەدەستەوە بو و گوتی: هەتاکو ئەم کتێبە لە دەستی میسـریاندا بمێنـێ ئێمە (ئینگلیز) ناتوانین لەو وڵاتەدا ئۆقرە بگرین.

با بخوێنێتەوە چۆن ئینگلیز قەشەیەکیان هەڵبژارد کە لە فێرگەی لاهوت دەرچـو بو تا بەرنامەکانی خوێندن بۆ میسر دابنێ و سەرپەرشتیان بکا. جا (دێنلۆپ) کرا راوێژکار و داڕێژەری سیاسەتی مەعاریفی میسری، تا وایلێهات چەندین نـەوە لـە قوتابخانەکانی میسر دەرچون و بێجگە لە شکوگومان هیچـی دیکـەیان لـە بـارەی ئیسلام نەدەزانی!

با بخوێنێتەوە لە کۆنگرەی موژدەگاران[1] کە لە سەرەتای ئەم سـەدەیە (سـەدەی بیستەم-وەرگێڕ-) لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کۆبۆوە، موژدەگـاران لاتبونـی ئـەرکی موژدەگاریان راگەیاند لەگەڵ نشوستی هێنانی لە بەجێگەیاندنی پەیامەکەیدا. کـە گوتیان لە دو جۆر موسڵمان بترازێ کەسی دیکە بـەپیر بانگەوازەکەمانـەوە نایـێ: منداڵێك کە لە کەسوکاریەوە رفێنرابێ ئەویش بچوکـە و هـەر لەسـەر دیانایـەتی پەروەردە دەکرێ و، ئاگای لە بیروباوەڕە رەسەنەکەی خۆی نیە، یا پیاوێکی پەڕپوت و لات کە هیچ رێگەیەکی ژیانی لەبەردەم نەمابێ مەگـەر بـون بـەدیان تـا پـاروە نانێکی دەسکەوێ، ئەمەش هـەر جێگومانـە داخـوا بەراسـتی بیروبـاوەڕی خـۆی گۆڕیوە یان نا. جا چۆن (قەشە زویمەر) هەستاوە کە لەو رۆژەی بڕیـاردەری کۆنگـرە

---

١ موژدەگاران: مبشر.

بو و گوتی: ئەوانەی وتاریان دا زۆر هەڵە بون. ئامانجی راستەقینەش ئەوە نیە کە موسڵمانان بگۆڕێن و چیدی دەست بە ئاینی خۆیانەوە نەگرن. لەمەشدا زۆر بە چاکی سەرکەوتوین لە رێگەی قوتابخانە تایبەتیەکانمان و، لە رێگەی قوتابخانەکانی حکومەت کە لەسەر پەیڕەو و بەرنامەی ئێمە دەڕۆن.

هەروەها با کتێبی (هێرش بۆسەر جیهانی ئیسلامی)[1] بخوێنینەوە کە لە دانانی کابرایەکی فەڕەنسیە، دەزانیّ چۆن موژدەگار و ئیمپریالیستان مکوڕبون لەسەر وروژاندنی (دۆزی ئافرەت) لە هەمو ئەو وڵاتانەی چونەتە ناوی، لەگەڵ بانگەواز بۆ (ئازادکردن)ی ئافرەت و بەسفوری دەرخستنی بۆ کۆمەڵگە تا رەوشت لەباریەك بچیّ و بەرگری دژە ئیمپریالیزم نەمێنیّ.

با لە کتێبی (ئیمپریالیزم و موژدەگاری)[2]ی عومەر فەروخ راڤەی ئەو ئامرازانە بخوێنینەوە کە ئیمپریالیزم و موژدەگاری بەکاریان دەهێنا. وە بە چ شێوەیەك بەردەوام پێکەوەن و، هەمیشە تێکدەگەن و، رێکارەکانیان بەردەوام لەیەك سەرچاوە وەردەگرن.

با لە کتێبی (ئیسلام لە دوڕیاندا)[3] بخوێنینەوە کە (لیۆپۆلد ڤایس) داینـاوە، چۆن رۆژهەڵاتناسان موژدەگاری دیـان بـون و لێکۆڵینەوە (زانستیەکان)یان لە پۆخڵەواتی دەمارگیری ئاینی خۆیان هەڵدەکێشا، ئەوجا هزرمەندانی جیهانی ئیسلامیش بەبیّ پارزونگ قسەکانیان لێوەردەگرن و، ئەو قسانە بەراست دادەنێن و ئیسلام بەدرۆ دەخەنەوە.

---

١ الغارة على العالم الاسلامي

٢ الاستعمار و التبشير

٣ الاسلام على مفترق الطرق

با لێکۆڵینەوە سەراسیمەکەی بخوێنێتەوە کـە دکتـۆر موحەمـەد ئەلبـەهی لـە کتێبی (هزری هاوچەرخی ئیسلامی و پەیوەندی بە ئیمپریالیزمی رۆژئاوا)[1]:

چۆن رۆژئاوا دەسەڵاتی سیاسی بەسەر رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا دەسدەکەوێ؟

چۆن موسڵمانان پاشکەوتو دەمێننەوە؟

چونکە خاچپەرستی ژاری کینەی خۆی هەڵدەرێژێ؟

ئەم سێ پرسـیارە لـە تـێڕوانینی رۆژئـاوای مەسـیحی داگیرکـەردا بەیەکـەوە پەیوەستن. مکوڕیشە کـە لـە دەسـبەکاربونی دەسـەڵاتی لـێرە لـە رۆژهـەڵات بـە پەیوەستی بمێننەوە، لەگەڵ ئەوەی کـە بونـی هـەر یەکـەیان و مانـەوەیان مایـەی دابینکردنی مانەوەی دوەکەی دیکەیە.

بۆیە، هەر لەو ئاستەوە کە دەسەڵاتی رۆژئاوا لە بەشـە رۆژهـەڵاتی ئیسـلامی دەسـبەکار بـوە، کـاری بـــۆ دواکـــەوتنی موســـڵمانان و بـــەتاڵکردنی کینـــەی خاچپەرستانەکردوە. رێگەیەکی دیکەش بۆ وەدیهێنانی ئەم مەبەستە نیــە بێجگـە لـە دەســت خســتنە نێــو (بابــەتی ئاراســتەکردنی نــاوخۆ) و بێســود کردنــی. لـە ئاراستەکردنی رۆژهەڵاتی ئیسلامیش لە ئیسلام و کەلەپوری ئیسلام بترازێ هیچـی تـر نـەبو کـە موسـڵمان لـە راڤـەی ئیسـلامەکەیاندا جێیـان هێشـتبو. کەواتــە گەندەڵکردنی ئیســلام و کەلـەپوری ئیسـلامی، یەکـەم مەبەسـتی ئیمپریـالیزمی رۆژئاوا بو. ئامرازەکەش بۆ ئەوە بریتی بو لە دەرخستن و بەرجەستەکردنی جیاکاری لەنێوان رۆژئــاوا و رۆژهــەڵات. لـە پێشـکەوتنی یەکـەم و دواکـەوتنی دوەمیـان. (زانست) و (توێژینەوە)ش لەوێ دەستیان بەگەڕانکرد بـەدوای ئـەو جیاوازیـەدا و،

---

[1] الفكر الاسلامي الحديث و صلته بالاستعمار الغربي

هۆکارەکانیش لەم دواییە لە روبەڕوبونەوەی نێوان مەسیحیەت و ئیسلامدا چڕ بۆوە.

(مەسیحیەت ئاینی پێشکەوتوان و، ئیسلام ئاینی پاشکەوتوان!

(جا لێرەدا هەندێ موسڵمان دەستیان بە بانگەوازی شوێنکەوتنی رۆژئاوا کرد لەوەی کە پێگەیشتون لە ژیاری پیشەسازی و هێزی سروشتی. بەڵام ئەو شوێنکەوتنەش بەروبومی بۆ رۆژهەڵاتی ئیسلامی نابێ مەگەر هەڵوێستێك لە ئیسلام وەربگرێ کە لە مەسیحیەت نێزیکی بکاتەوە!)

❊ ❊ ❊

بەڵێ. هەر کەسێکی گومانی لەو هێرشە خاچپەرستانەی ئێستا هەبێ لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا و، هەر کەسێکی گومانی لە هێرشی زایۆنی ئێستا هەبێ.. با مێژو بخوێنێتەوە!

جا -کە مێژو دەخوێنێتەوە- دەزانێ چۆن خاچپەرستی و زایۆنیزم مکوڕبون لەسەر ئەوەی موسڵمانان لە ئاینەکەیان دور بخەنەوە و، وێنەی ئاینەکەیان لە زەیندا بشێوێنن و، وای پیشاندەن کە ئیسلام دواکەوتن و داڕوخان و هیشکی و پاشکەوتنخوازیە دەبێ تا زوە مرۆڤ خۆی لێ دامالێ و، خۆی لە نەفامیەکەی رزگار کا و، لە بارە گرانەکانی ئازاد بێ.

دەشزانێ ئەو رۆڵە رێکخراو و لێکۆڵراوە و، بەوردی جێبەجێکراوە چی بوە کە بۆ کاول و وێرانکردنی رۆژهەڵاتی ئیسلامی لە بناغەوە خراوەتە گەڕ. بە قوچاندنەوەی کۆڵەگەکانی ئاین و، کردنەوەی گرێبەندی رەوشت و، لەناوبردنی نەریتەکان و، دەرچواندنی (بانگەوازکاران) لەنێو خودی موسڵماناناندا کە بانگەشەی وێرانکاری ئاین و رەوشت و نەریت بکەن. لەگەڵ پاڵنانیان بۆ پلە و پایەی گەورە و

سەنتەری ئاراستەکردن. هەتا خاچپەرستی و زایۆنیزم خۆیان لەپـــەنا حەشـاردەن و، موسڵمانانیش بە قسەکانیان بخەڵەتێنێ، گوایە موسڵمانی.. نوێخوازن!

لە کۆتاییدا ئەوەش دەزانێ کە هەوڵی دو سەدەی تەواو و، نیشتەی شـوێنەواری ئەو هەوڵانە لە دەرونی موسڵماناندا، بە هاوارێکی بەرێوەی نێو کتێب لەنێو ناچن!

نەخێر! من چاك دەزانم خەڵك تەنیا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە و هـەزار کتێبـی دیکەش نابنە موسڵمان.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی نوسەری دڵسۆز وایە کە خەڵکی ئاگادارکاتەوە.

ئێمە روبەڕوی دوژمنانێکین یەك چرکە واز لە دوژمنداری و هەوڵی لـەناوبردنمان ناهێنن. ئێمە روبەڕوی خاچپەرستی جیهانی و زایۆنیزمی جیـهانی دەبینـەوە. کـە لـەئیمپریالیزمی رۆژئـاوایی یـا رۆژهـــەڵاتیدا دەردەکـــەون و، لـــە ئیســـرائیلدا رەنگدەدەنەوە.

هەروەها ئێمە پێویستیمان بە تێکۆشانێکی بەردەوام هەیـە بـۆ روبەڕوبونـەوەی ئەو دوژمنانە.

تێکۆشانیش بە خۆزگە و نیازان نیە و، بە خوێنگەرمیـەك نیـە کـە لـە نـاخ و دەرونەوە بەتاڵبێ.

تێکۆشان ئارەقە و خوێن و فرمێسکە.. تێکۆشان قوربانی دانی بەردەوامـە بـە خود و بە ماڵ و بە ماندوبون.

نەتەوە تاواوەکانیش نازانن تێکۆشان چیە..

دەبێ بیروباوەڕ هەبێ.. دەبێ بیروباوەڕ هەبێ.. دەبێ بیروباوەڕ هەبێ.

دەبێ بیروباوەڕێکی پتەو و توند پێکەوە بەستراو هــەبێ. پێــش لێکــترازانی بــۆ ماوەیەکی درێژ بەرگری فشارەکان بکا. بەڵام ئەگەر بــە ســوك و ســانایی پێکــەوە گرێدرابو هەر لەگەڵ یەکەم راکێشان خاودەبێتەوەو جڵەوگیری سانا دەبێ.

چەند نەوەیەك لە نەتەوەش لەسەر نەوەی پۆڵایــین دەژی بــەر لــەوەی دابــەزێ و بگاتە ژێرەوە. پاشان ئەو نەوەیە رۆڵێکی دو چەندانە پێشکەش بە خۆی و نەوەکانی دوای خۆی دەکات.

بەڵام ئەگەر هەر لە بنــەڕەتدا مــەبدەئی پتــەوی پۆڵایــین رەت بکاتــەوە و، بــە توندڕەویەکی نا پێویستی دانێ. ئەوا بەبێ گرێ تا بنار غلۆر دەبتەوە و، لە کۆتایی لەنێو دەچێ.

ئێمەش -بەتایبەتی- لە هەمو خەڵکی پتر پێویستیمان بە بیروباوەڕە.

ئێمە -بێ بیروباوەڕ- گەلێکی ئاسانی نەرمی شلوشۆقین کە خێرا دەتاوێینەوە.

بە بیروباوەڕیش موعجیزە دروست دەکەین..

هەمو مێژوشمان بریتیە لەم حەقیقەتە.

ماوەیەك دەست بە بیروباوەڕەوە دەگرین یــان دەگەڕێینــەوە ســەری جــا گیــانی پاڵەوانێتی و گیانی بایەخدان و گیانی تێکۆشانمان دێتە بەر و، لە ماوەیەکی کــاتی کورتدا سەراسای وا دروست دەکەین کە چەند نەوەیەکی پێویستە.

کە واز لە بیروباوەڕیش دەهێنین یا تەمبەڵی لە ئاست دەنوێنین دەبینین بوین بــە پارچە و پوچی هەڵوەریو کە هێزێکی نیە رایگرێ تا بەرنەبێتەوە.

گەلانی ئەوروپاش، کە رەوشتیان داشەپیوە و، لە بیروباوەڕ دورن، حەتمیــە هــەر دەتاوێنەوە و بەپێی سونەتی خودا لەسەر زەوی لە کۆتایی لەنێو دەچن: ﴿وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً: شێوەی کاروبــاری خــوا گۆڕانــی بەســەردا نایــە.﴾الأحــزاب/٦٢.

بەڵام لەبەر کۆمەڵە هۆکارێك لە ژینگە و لـە بنیـاتی خۆیـدا هێـدی هێـدی شـی دەبێتـەوە و زۆر خـۆی دەگـرێ. ئەمـەش لـەو توانـا گەورەیـــەی بەرهەمـــهێنان دەردەکەوێ لەگەڵ بەردەوامی کارکردن. کرێکار و فەرمانبەر لەوێ شەش سـەعاتی تەواو (بێجگە لە نیو سەعاتی حەسانەوە و خواردن و خواردنـەوە) شـەش سـەعات کاری راستەقینە، نە رۆژنامە دەخوێنێتەوە و، نـە هاوسـێیەکەی دەیدوێنـێ و نـە نوکتەیـەك دەگێڕێتـەوە و نـە لەسـەر هـەواڵێك دەدوێ و نـە یـــەك چرکــە لــە بەرهەمهێنانی دانابڕێ.

جا کێ لە ئێمە ئەو کارە دەکا یا خۆی تێدا رادەگرێ؟

کرێکاری ئیسرائیلیش کە دژی عارەبان تێدەکۆشێ و نیشتمانیان داگـیر دەکـا. شەش سەعاتی رێك بە کرێی کەمکراوە کار دەکا، پاشان چەند سەعاتە کـارێکیش بە خۆڕایی دەکا، بۆ زۆربونی بەرهەم.

جا کێ لە ئێمە ئەوە دەکا یا خۆی تێدا رادەگرێ.

ئەوانە دوژمنانمانن با بیانناسین.

دەشبێ ئێمە لەوان ئازا و خۆراگرتر بین تا بەرامبەر تێکۆشـانی ئـەوان خۆمـان رابگرین و بەسەریاندا زاڵ بین.

ئێمـەش بـەیاریدەی خـوا ئـەوەمان هـەر پێدەکـرێ، چونکـە پێشـتر خۆمـــان تاقیکردۆتەوە و توانیومانە.

بەڵام لەوەدا پێویستیمان بە بیروباوەڕ هەیە. گرێیەکی پۆڵایینی پتـەومان دەوێ کە ماوەیەکی درێژ بەرگری فشار بکا پێش ئەوەی خاو ببێتـەوە. پێویسـتیمان بـە ناوکێکی پۆڵایینی پتەو هەیە کە نەشکێ و نەرم نەبێتەوە.

ئاتاجی ئەوەین شلوشۆق و نەرمۆڵکە و تەڕ نەبین..

پێویستی ئەوەین چاوی برسی و دەرونی وێڵ و پێکەنینی بێتام و رۆینی بەلار و لەنجە و قسەی ناشیرن و هەستی برسی بـۆ رابواردنـی ئاژەڵانـەمان تێـدا بزربـێ و نەمێنێ.

پێویستی ئەوەین رەوشت و ناموس و نەریتمان هەبێ.

پێویستمانە ژنەکانمان -کە بنیاتنەری نەوەکانن- دەرونی ئادەمیزادانە بـن نـەك پارچە گۆشت و جەستەی برسی.

ئاتاجی ئەوەین هەستمان لە زەلکاوی سێکس بەرزبێتەوە و هەستو سۆزمان بـە راستی بێ و دەرونمان پاك بێ.

پێویستمان بە لاوانێکە لە روی دەرونیەوە سەقامگیر بـێ تـا بتوانـێ هـەوڵبدا تێبکۆشێ و، دیارە ئەگەر کات و ماندوبونی خـۆی بەبـەرەڵایی وەکـو سـەگی پـێ سوتاو بە سوڕانەوەی شەقامان خەرج بکا ئەمەی پێناکرێ.

***

هەروەها من گەلێك هۆ دەزانم کە لاوان لە ئیسلام دوردەخاتەوە.

دەشزانم خەڵك تەنیا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە نابنە موسڵمان.

لەگەڵ ئەوەشدا بێگومانم کە دوارۆژ دوارۆژی بیری ئیسلامیە.

مەرج نیە من بەخۆم وەدیهاتنی ئەم بیرۆکەیە لە داهاتویەکی نێزیکدا ببینم.

بەڵام تەمەنی نەتەوان بە تەمەنی تاکە کەسان ناپێورێ و، بە مـاوەی نزیکیـش ناپێورێ.

هەروەها من وا هەستدەکەم -هیچ گومانیشم نیە- کە ئیسلام تەنیا ئاینی ئـەم ناوچەیە نیە، بەڵکو سبەی دەبێتە سیستەمی مرۆڤایەتی.. سیستەمی مرۆڤایـەتی ئەگەرچی هەموشیان نەبن بە موسڵمان.

ئەوروپا بیروباوەڕی جەڕباند و تیایدا گەیشتە دوا بڕیار.

ژیاری ماددی بێبڕوای بێئاینی دور لە خوداشی تاقیکردەوە.

یەکەمجار لەگەڵ سەرمایەداری تاقیکردەوە...

جا باوەڕی بە سەرمایەداری نەما.. چونکە ئەو سیستەمەی تێدا نەدیتــەوە کـە دەیوست..

پاشان لەگەڵ کۆمۆنیزم تاقیکردەوە..

لە داهاتویەکی نێزیك یا دور باوەڕیشی بە کۆمۆنیزم[1] نامێنێ.

دەبینێ کە کۆمۆنیزم نایگەیەنێتە ئەو ئاواتەی بەتــەمای بـو ئەگـەر خـۆراك و نشینگە و سێکسیشـــی بداتــێ.. (داخوازیـە سـەرەکیەکان)ی کـە (مـارکس) لـە مانیفێست (بەیاننامەی کۆمۆنیزم)دا دیاریکردبو.. ئەوانەشی بداتێ، ئەوا ئاسایش و حەسانەوە و خۆراکی رۆحی ناداتێ.

مرۆڤایەتی هەر ئەو هەستەی دەمێنێ کە شتێك لە قەوارەیدا هێشتا تێر نەبوە. کۆمۆنیزم تێری نەکرد و، ژیاری ماددی بێــبڕوای بێئـاینی دور لــە خـوداش تـێری نەکرد.

ئەو کاتە بۆ بیروباوەڕ دەگەڕێتەوە.

دەگەڕێتــەوە بــۆ سیســتەمێك واقیعـی مـادە و واقیعـی رۆح لــەخۆ بگــرێ، سیستەمێك یاسا بۆ زەوی دانێ و ئاراستەی بەرەو ئاسمان بێ. سیستەمێك هــەردو بەشی ئەم بونەوەرە ئادەمیە بکاتەوە یەك: چنگە قوڕ و فوە روحێك.

جا ئەو سیستەمەش ئیسلامە.

---

[1] ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٧٩ز بڵاو بۆتەوە. -وەرگێڕ-

هیچ شتێکی دیکە لەسەر زەویدا نیە ئەم حەقیقەتە لەخۆ بگرێ.

زەروریش نیە کە خەڵك لە رۆژئاوا بیروباوەڕی ئیسلامی وەرگرن. زەروری نیە ناویان ببێتە (ئەحمەد) و (محەمەد) و (مەحمود).

بەڵام بە حوکمی زەرورەت بۆ بیری ئیسلامی دەگەڕێنەوە. بە حوکمی ئەو تاقیکردنەوەی کە دو سەدەی رێك چێژتیان و، ئەو رۆژانەی بەسەریاندا هاتن و، گەیاندنیە ئەو ترسە بکوژ و وێرانیە تۆقێنەرە.

موسڵمانانیش کە ئەو زەخیرە مەزنەیان هەیە شیاو و شایستە ترن کە ببنە یەکەمینی ئەوانەی کە بۆ ئەم بیروباوەڕە دەگەڕێنەوە و سود لە وزەکانی وەردەگرن.

شایستەن بگەڕێنەوە بۆ یەکەمین پلە و پایەی مێژوییان: نەك لە کلکەی کاروانێ بەڵکو لە پێشەوەی جڵەودا.

دەشتوانن وابن ئەو کاتەی بڕوا بە خودا دێنن و رەوشتەکانی ئەم ئاینە هەڵدەگرن.

# ناوەرۆك

ئەمڕۆ لەم وڵاتە و لە تێکڕای ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ههرایەک بەرپایە بە نەریتەکانەوە پەیوەستە و جەنگێکیش لە ئارادایە و لە گەڕ ناکەوێ، ئەم نەریتە (بەسەرچوانە). ئەم نەریتە (کۆنانە).. ئەم نەریتە (دواکەوتنخوازانە).. ئەم نەریتە وشک و بەرد ئاسا و.. دواکەوتو و بۆگەنیوانە دەبێ لە ناوببرێن، دەبێ لە بناغەڕا هەڵتەکێن.. دەبێ بخرێنە ژێر پێیان.

دەبێ کۆمەڵگەیەکی تازە دامەزرێ.. کۆمەڵگەیەکی ئازاد.. کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتنخواز.. کۆمەڵگەیەکی گەشەسەندو و.. کۆمەڵگەیەکی ڕەها لە کۆت و بەندان.

جەنگی نەریتەکان بەو شێویە هەڵدەسوڕێ.

جەنگێکی گەرمە و هەموو بوارێکی داگرتوە.

گۆڕەپانەکەی بریتیە لە ماڵ و شەقام و.. سینەما و فێرگە و.. میترۆ و ئۆتۆمبێل و.. ڕۆژنامە و.گۆڤار و.. وتار و کتێب و.. لادێ و شار.

سەربازەکانیشی بریتین لە هەموو خەڵکی.

سەربازەکانی کچ و کوڕی لاون و.. باوکان و منداڵان و مامۆستا و قوتابیانن و نوسەرانی پیاو و ژنن و چاک و خراپن و هەموو مرۆڤێکی نێر و مێیە.

محمد قطب